# دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی

# Psychology of Individual Differences





پرۆفیسۆری یاریدەدەر
نازەنین عوسمان محمد

# دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی

Psychology of Individual Differences

پرۆفیسۆری یاریدەدەر

نازەنین عوسمان محمد

چاپی یەکەم

٢٠٢٢

لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە ٨٧٨





ناسنامەی کتێب

## دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی

❖ ئامادەکردنی: پرۆفیسۆری یاریدەدەر. نازەنین عوسمان محمد
❖ بابەت: دەروونزانی
❖ دیزاینی و بەرگ: فواد کەوڵۆسی
❖ نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
❖ ساڵی چاپ: ٢٠٢٢
❖ شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج
❖ تیراژ: ١٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن: (١٧٨٦)ی ساڵی ٢٠٢٢ی پێدراوە.

---

**ناونیشان**

سلێمانی ــ سابوونکەران ــ نێوان گەراجی عوسمانی تەمین و شوقەکانی تەکیە رووتە.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕست


پێشگوتن ........................................ ٧

## بەشی یەکەم

سەرەتاکانی جیاوازی تاکایەتی ........................................ ١٦

گرنگی خوێندنی جیاوازی تاکایەتی ........................................ ٢٢

چەمکی جیاوازی تاکایەتی ........................................ ٢٥

جۆرەکانی جیاوازی تاکایەتی ........................................ ٣٠

جیاوازی ڕەگەزی لە پێکهاتەی توێکلی مێشکدا ........................................ ٣٤

## بەشی دووەم

ئامانجی جیاوازی تاکایەتی ........................................ ٤٥

سیفەتە گشتیەکانی جیاوازی تاکایەتی ........................................ ٤٦

هۆکارەکانی دروستبونی جیاوازی تاکایەتی ........................................ ٥٢

پێوانەکردنی جیاوازی تاکایەتی ........................................ ٥٤

دابەشبونی جیاوازی تاکایەتی ........................................ ٥٥

## بەشی سێهەم

جیاوازی لە ناو خودی یەك کەسدا ........................................ ٦٣

جیاوازی سیفەتەکان لەناو خودی یەك کەسدا ........................................ ٦٥

ئاستی گۆڕانکاری لە خەسلەتەکانی یەك کەسدا ........................................ ٦٨

پێوانەکردنی جیاوازیەکانی ناو خودی یەك کەس ........................................ ٧٠

تایبه تمەندی جیاوازی تاکەکەس لەناو خودی خۆیدا ........................................ ٧٢

بەشی چوارەم

جیاوازی نیوان گروپەکان ........................................................................ ٧٧
جیاوازی تاکایەتی لە پێکهاتەی کەسێتیدا ...................................................... ٨١
جیاوازی تاکایەتی و ڕەفتار ................................................................... ٨٦
جیاوازی تاکایەتی لە پرۆسە عەقلییە بالاکاندا ............................................... ٨٨
جیاوازی تاکایەتی و فێربونی زمان .......................................................... ٨٩
جیاوازی تاکایەتی و خەسلەت .................................................................. ٩٠
جیاوازی تاکایەتی لە توانا هزریەکان و زیرەکیدا ............................................. ٩٢
پێنج تایپە سەرەکیەکەی کەسێتیThe big five model of personality .............. ١٠٢
تایپی کەسێتی (A)و (B)........................................................................ ١٠٣
تایپی کەسێتی خولقێنەری ژینگەکەی ........................................................... ١٠٥
کەسایەتی میکافیللی ............................................................................. ١٠٧
جیاوازی تاکایەتی لە پاڵنەرەکاندا ................................................................ ١٠٩

بەشی پێنجەم

پێکهاتەی مێشك ................................................................................... ١١٥
مێشك چۆن دروست دەبێت؟ ئەم بابەتە چیمان فێردەکات؟ ........................................ ١١٧
لە پیتاندنی هێلکەوە تا سێمانگی دووەمی سکپڕی ............................................... ١١٨
لە لەدایك بونەوە تا دوسالی ..................................................................... ١٢١
سەرەتای مندالی .................................................................................. ١٢٤
قۆناغی سەرەتای هەرزەکاری تا بیستسالی و بەرەو ژوور ..................................... ١٢٥
ئەو تایبە تمەندیانەی کە ئێمە دەباتەوە بۆ ناو سروشتی مرۆڤایەتی .......................... ١٢٧

ئێمە چۆن نەخشەی مرۆڤایەتیمان وەرگرتوە؟ ........................................ ١٣٠
ئەو سیفاتانەی کە تاکایەتیمان ( فەردانیەتت )پێ دەبەخشێت .............................. ١٣١

## بەشی شەشەم

چۆن لە دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی_نێوان خوێندکار تێبگەین .............................. ١٣٩
مێشك چۆن فێردەبێت........................................................................ ١٤٠
یەکەم. تۆڕی ناسینەوە: ....................................................................... ١٤٣
جیاوازی تاکایەتی لە تۆڕی ناسیەنەوەدا ........................................................ ١٤٧
دووەم. تۆڕی ستراتیجی: ...................................................................... ١٥٠
جیاوازی تاکایەتی لە تۆڕە ستراتیجیەکاندا.................................................... ١٥٤
سێهەم تۆڕی هەڵچونی ........................................................................ ١٥٦
جیاوازی تاکایەتی لە تۆڕی هەڵچونیەکاندا................................................... ١٦١
بەشی حەوتەم ................................................................................ ١٦٩
لێهاتویی مامەڵەکردن لەگەڵ جیاوازی تاکەیەتی لەلایەن مامۆستاوە ............... ١٧١
ڕێوشوێنی مامەڵەکردن لەگەڵ جۆری کەسێتی خوێندکاراندا: ...................... ١٨٢

# پێشگوتن

حیکمەتی سروشت هێندە بەهێزە کە ناتوانین چاوی خۆمان لە ئاستیدا بگرین، بونەوەران و هەمو گیانێکی زیندو لەم جیهانەدا بونێکی تایبەت بەخۆیان هەیە، ئەم هەمەڕەنگیو هەمە چەشنیە زەنگینیەکی بەخشیوە بە ژیانو ژیانی قەشەنگترو بە چێژتری کردووە، پێکهاتەی مێشکی مرۆڤیش بەجۆرێکە کە بە ئەزمونی نوێو تاقیکردنەوەی شتی تازەو جۆراو جۆر زیاتر چالاك دەبێت وە چێژ وەردەگرێت، شتی دوبارەو یەکنەوا هەمیشە هەراسانکارە بۆمرۆڤو مێشك سست دەکات و کارەکان دەکاتە ڕۆتین، ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی شارستانی بەم شێوەیە بەردەوام بووەو هەوڵیداوە کارەکانو دوبارە نەکاتەوەو شتی نوێ بخوڵقێنێت، کێ پێی خۆشە هەموساڵیادی لەدایکبونی هەمان دیاری پێشکەش بکرێت، کێ دەتوانێت هەمو ڕۆژێك هەمان خواردن بخوات، کێ هەراسان نابێت کە هەمو ڕۆژێك هەمان کراس بپۆشێت.کێ پێی خۆشە هەمو ڕۆژێك لەگەڵ هەمان کەس قسە بکات...هتد. کەواتە بنەمای پرۆسەی ژیان جیاوازیو گۆڕانکاریە، ئامانجی زۆربەی زانستەکانیش ناسینیو پێشبینیو تێگەیشتنی ئەم جیاوازیو گۆڕانکاریانەیە، هەربۆیە کاتێك باس لە دەرونزانی جیاوازی تاکایەتی دەکەین دەبینین کە تەنیا زانستی دەرونزانی خۆی پێوە خەریك نەکردوە بەڵکو لە زانستی فەلەکەوە سەری هەڵداوە و زانستەکانی تری و بایلۆژیا، ئامارو پەروەردە پەرەیان بەم زانستە داوە کە دواجار وەکو لقێکی دەروناسی خۆی ناساندوە، لێکۆڵینەوەو توێژینەوە تیایدا بەردەوامە.

جیاوازی تاکایەتی لقێکی دەرونناسیە، کەئامانجی ناسینی جیاوازی تاکەکەسەکانە لە هەمو بوارەکاندا، تا ئامانجی زانست لە تێگەیشتنو پێشبینی وچارەسەری بەدەست بهێنێت. دەکرێت بوترێت کە دەرونناسی جیاوازی تاکایەتی توێژینەوە لەسەر جیاوازیی جەستەیی وهزری ودەرونی ئەنجامدەدات، کە کەسێك لەوەی تر جیا دەکاتەوە، ئەم کەسە زیرەکترە لەوەی تر، ئەم کەسە کەمتر کەسێکی داخراوە لەوەی تر، فڵانە کەس باڵای بەرزترە لە فڵان. دەبێت ئەم تایبتمەندیانە بناسین تا بتوانین مامەڵەی هەر کەسێك بە پێی خۆی بکەین. هەمومان لێهاتویەکی خۆڕسکمان هەیە بۆ مامەڵەکردنی کەسە جیاوازەکان بە پێی سیفەتەکانیان، ئەمەش وامان لێدەکات هەر کەسێك لە ئێمە کەسێتیەکی بێوێنە وتاك بنوێنێت، هەر ئەمەش گرنگی دەدات بە لێکۆڵینەوەی جیاوازی تاکایەتی بە شێوەیەکی زانستی.

بابەتی دەرونناسی جیاوازی تاکایەتی لە زۆر لایەنەوە گرنگی خۆی هەیە بەتایبەت لە بواری پەروەردەو خوێندن لە پێناوی ڕوبەروبونەوەی کێشە پەروەردەییو کرداریەکانی منداڵ لە قۆناغە جیاوازەکانی خوێندنیدا، ئەویش بە ناسینی خواستو حەزو تواناو گرنگیپێدانەکانیان. دیسانەوە ئەم بابەتە گرنگی لەبواری کارو پیشەدا هەیە لە پێناو جێبەجێکردنی پرنسیپی (کەسی شیاو بۆ کاری شیاو) دانانی کەسەکان بە پێی تواناو حەزەکانیان لە نیشو پیشەکاندا، هەروەها لە ڕوی کلینیکیەوە ناسینی ئەو کەسانەی کە چاودێری تایبەتیان پێویستە یان خاوەن پێداویستی تایبەتن، وەکو ئەو [illegible]لانەی کە ئۆتیزمیان هەیە یان لاوازی توانا عەقڵیەکانیان هەیە یان [illegible] وتوانای عەقڵی زۆر بەرزیان هەیە.

[illegible] بە ئامادەکردنی ئەم پەڕاوە زۆر سەرچاوەم [illegible] دەرونناسی جیاوازی تاکایەتی، زۆریان ئاماژەیان بە بابەتی

زیرەکیو پێوانەکردنی زیرەکیو بابەتی بەهرەمەندانو داهێنان دەکرد، بەڵام زۆر بەکەم ئاماژەیان بەو هۆکارانە کرد بوو کە جیاوازی تاکایەتی دروست دەکەن، هەردو فاکتەری ژینگەو بۆماوە، دیارە کە هۆکاری ژینگەیی زۆری لەسەر نوسراوە لە زۆر پەڕاوی تردا ئاماژەی پێکراوە و سەرچاوەش بە کوردی زۆرن لەسەری، بەڵام بابەتی بۆماوەیی وچۆنیەتی گەشەی مێشك و وەرگرتنی سیفەتە بۆماوەیەکان تارادەیەك سەرچاوەی کوردی لەسەری کەمە بۆیە لێرەدا بەشێکم بۆ ئەو بابەتە تەرخان کردووە کە لە کتێبێکی نوێی دکتۆر جۆ دیسپۆنزاوە وەرمگێڕاوە کتێبەکەی ناوی (کامڵ بونی عەقڵە) تازەترین کتێبیەتی لەساڵی ۲۰۲۱دا کراوە بە فارسی.

بەشەکانی تری پەڕاوەکەشم بەجۆرێك ئامادە کردوە کە بگونجێت وەکو پرۆگرامی خوێندنی زانکۆ بۆ کۆلێجی پەروەردەو دەرونزانیو بەشەکانی وەکو دەرونناسیو بەشی پەروەردەی تایبەت بتوانرێت سودی لێوەربگیرێت. بێگومان ئەمە نابێتە ڕێگر لەوەی کە هەموو ئەو بەڕێزانەی لەبواری پەروەردەدا کار دەکەن هەر لەباوانو مامۆستاو سەرپەرشتیارانەوە دەتوانن سودی لێوەربگرن.

پێم خۆشە ئاماژە بەوە بکەم کە هەمیشە سوپاسگوزارم بۆ هاوکاریو پاڵپشتیو دڵسۆزی هاوسەرکەم (مەزن سلیمان) بۆ زۆربەی ئەو کارانە بە ئەنجامی دەگەیەنم. لەگەڵ سوپاسی تایبەتم بۆ دەزگای نارین وکاك هاوبەش کە هەمیشە پاڵپشتی چاپکردنی بەرهەمەکانم بوو، نمونەیان زۆر بێت.

پرۆفیسۆری یاریدەر: نازەنین عوسمان محمد

۲۰۲۲/۹/۸

سلێمانی

## بەشی یەکەم

- پێشەکی
- سەرەتای دەرکەوتنی جیاوازی تاکایەتی
- گرنگی خوێندنی جیاوازی تاکایەتی
- چەمکی جیاوازی تاکایەتی
- جۆرەکانی جیاوازی تاکایەتی
- جیاوازی ڕەگەزی لە پێکهاتەی توێکلی مێشکدا
- هۆکارەکانی دروست بونی جیاوازی تاکایەتی

# پێشەکی

جیاوازی تاکایەتی دیاردەیەکی گشتییە هەموو بونەوەرەکان بە مرۆڤو بونەوەرەکانی ترەوە لە گەورەترینەوە تا بچوکترینی دەگرێتەوە، سەرباری ئەوەی ئەم جیاوازییە لە نێو خۆی تاکەکەسیشدا دەبینرێتەوە هەر لە شێوازی بیرکردنەوەی تا دەگات بە چۆنیەتی خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگەو مامەڵەکردنی لە هەڵوێستە جیاوازەکانی ژیاندا. زانای دەروونناسی (هۆڵ) دەڵێت:" مرۆڤەکان لە ڕوی توانای هزریو توانای فێربونو لێهاتویی چارەسەری کێشەکان وچۆنیەتی وەڵامدانەوەیان بۆ هەڵچونەکانی وەکو؛ ترس وتوڕەبون وتوندوتیژی جیاوازن، ئەمە جگە لە جیاوازیان لە پاڵنەرەکاندا وەك (سێکس، برسێتی، تونێتی حەزی گەڕانو دۆزینەوە...هتد)(ابو حطب، ١٩٨٠و الزغبی، ٢٠١٤).



جیاوازی نێوان مرۆڤەکان تەنیا لایەنی دەرونی ناگرێتەوە بگرە لایەنی جەستەیی وبیۆکیمیاوی وکاری ئەندامەکانی جەستە وەکو؛ دڵ وسیەکان ومیشك...هتد دەگرێتەوە، کەواتە جیاوازی لە هەر سیفەتێك و ڕەفتارێك کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات، دەتوانرێت سەرنجبدرێت و ببینرێت و بپێورێت. هەتا ئەم جیاوازیانە لە نێوان ئەو خوشکو برایانەدا دەبینرێتەوە کە لەیەك دایك و باوك لەدایکبوون.

جیاوازی و تایبەتمەندی لە کەسێتیشدا هەیە ئەوەتا لە کارو بەرهەمی هونەریدا بە جوانی هەستی پێ دەکرێت. پەروەردکاران هەستیان بەم جیاوازیانە کردوەو هەوڵیانداوە دەستنیشانی بکەن لە ڕێگەی پرۆگرامی تایبەتەوە ڕێکیبخەنەوە، بۆ ئەوەش جۆرەها پێوەرو ئامڕازی پێوانەکردنیان بۆ داهێناوە.

بە پێی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم بوارەدا ئەنجامدراون دوو بۆچون هەیە، کە سروشتی جیاوازی تاکایەتی ڕون دەکاتەوە ئەو دو دیدگایەش ئەمانەیە:

**دیدگای یەکەم:** وای دەبینێت کە ژینگەو کۆمەڵ بەهەمو ئەو کاریگەریە جۆراو جۆرانەوە کە هەیانە هۆکارن بۆ دروستبونی جیاوازی تاکایەتی. لەم بۆچونەدا ئەوە دەردەکەوێت، کە مرۆڤەکان یەکسانن لە ڕوی تواناو ئامادەباشی و لێهاتوییانەوە، ئەو جیاوازیانەی لە نێوان تاکە کەسەکاندا دەردەکەوێت بەهۆی جیاوازی بواری پەرەپێدان و گەشەپێکردنی ئەم تواناو ئامادەباشیانەوەیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە بوارەکان بۆ هەمو کەسەکان وەکو یەك یەکسان نییە، لێرەوە ئەم دیدگایە جەخت لەسەر زەرورەتی دابینکردنی بواری یەکسان بۆ هەموان دەکاتەوە.

ئەدەبی دەروونی دو ئاراستەی هەیە

مرۆڤەکان یەکسانن لە توناکانیاندا، ئەو جیاوازیەی هەیە تەنیا لەو بوارانەدایە کە پێشکەشیان کراوە، بۆیە دامەزراوە پەروەردەییەکان پێویستە بواری یەکسان ببەخشێتە هەموو کەسێك تا بتوانن توناکانیان پێش بخەن

مرۆڤەکان لە ڕێگەی بۆماوەوە جیاوازن لە پێکهاتەی ئەندامەکانیان.بەلام لەسەر ئاستی پەروەردە یەکسانی بەوە دروست نابێت کە بواری یەکسان بۆ هەموان بڕەخسێنرێت، بەلکو بەوە چارەدەبێت کە سیاساتی پەروەردەیی گونجاو بۆ توانای کەسەکان دابڕێژرێت تا سود لەو توانایانە ببینرێت کە هەیە.

**دیدگای دووەم:** ئەو جیاوازیانەی لە نێوان تاکەکاندا دەردەکەوێت دەگەڕێتەوە بۆ لایەنی بایلۆژیو جەستەیی کە لە ژێر ڕۆشنایی ئامادباشیی بۆماوەییو ئەو جیناتانەوە دروستدەبێت کە لە کرۆمۆسۆمی باوانەوە وەرگیراوە. بۆیە پێویستە کۆمەلگا سود لەو بەهرەمەندیو تواناو بلیمەتییە وەربگرێت کە بۆماوە دەیبەخشێت بە تاکەکان لە ڕێگەی داڕشتنی پرۆگرامی گونجاوی پەروەردەیی بە هەموو ئاستو تونایەکی عەقلیو جەستەیی تاکەکان.

ئێمەش ئەوە دوپاتدەکەینەوە کە مرۆڤەکان یەکسانن ئەگەر بواری هاوسەنگو یەکسانیان بۆ فەراهەم بکرێت، بەلام هێشتا وەلامدانەوەیان بۆ هەلوێستە جۆراو جۆرەکانی ژیان جیاوازە بە هۆی تایبەتمەندی جەستەییو دەرونیانەوە. بۆیە ڕەچاوکردنی ئەو جیاوازیانە وا دەکات کە مرۆڤایەتی سود لەو هەمو بەهرەو توانایە وەربگرێت کە سروشت بە مرۆڤەکانی بەخشیوە. بەو واتایەی کە کۆمەلگا بتوانێت ئەو بوارانە فەراهەم بکات هەمو کەسێك چی لەتوانایدابێت بیکات، چونکە وەك سادگورو کە فەیلەسوفێکی هندیە

دەڵێت کێشە ئەوە نییە کە ئەو شتانە نەکەین کە ناتوانین بیکەین، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە ئەو شتانە نەکەین کە دەتوانین بیکەین. سەرنجبدەن کێشەی کۆمەڵو دەوڵەتەکانیش ئەمەیە کە مرۆڤەکان زۆر شتیان لەتوانادا هەیە بیکەن بەڵام نایکەن؟ هۆکاریش زۆرە بۆ ئەو نەکردنە، ئەگەر بەو ئاستە گەیشتین کە هەمو تاکەکەسێك چی لە توانایدا بێت بیکات زۆر کێشەی کە ئەمڕۆ مرۆڤەکانی هەراسان کردووە بەئاسانی چارەسەر دەبوو.

## سەرەتاکانی جیاوازی تاکایەتی

مرۆڤ هەر زۆر زووهەستی بەو جیاوازیانە کردوە کە لە نێوان کەسەکاندا دەرکەوتووە. ئەوەی زانیوە، کە کەسانێك هەن شەڕکەری باشن و کەسانی تریش هەن ترسنۆکن. زاناکانو دەسەڵاتداران بە باشی سەرنجی جیاوازی تایبەتمەندی کەسەکانیان داوە. واتە زۆربەی زانستەکان گرنگیان بە جیاوازی تاکایەتی داوە وەك لەخوارەوە ڕونی دەکەینەوە.

### سەرهەڵدانی جیاوازی تاکایەتی لە فەلسەفە کۆنەکاندا

دکتۆر سەید خێرالله دەڵێت؛" ئەفلاتون کاتێك ئامانجی بۆ کۆمارە نمونەییەکەی نوسیوەتەوە هەر تاکێکی لە ئیشێکدا داناوە کە بۆی بگونجێت. لەبەشی دووەمی کتێبەکەیدا ئەمەی نوسیوە؛" گەر دو کەس هاوشێوەی یەکتر لە دایك نەبوبێت، ئەوا هەر کەسێك جیاوازە لەوەی تر لە لێهاتووییە سروشتیەکانیدا، بەجۆرێك کەسێکیان بۆ ئیشێك شیاوە ئەوەی تریان بۆ ئیشێکی تر". ئەفلاتون مرۆڤەکانی بۆ چەند توێژو گروپێك دابەش کردوە، بە پێی جیاوازیان، بۆ هەر یەکەشیان پیشەیەکی دیاریکردووە کە بگونجێت لەگەڵ جیاوازیەکانیاندا بۆیە نوسیویەتی: "توێژێك خاوەنی عەقڵو حیکمەتە، ئەوانە شیاوی دەسەڵاتداریو بەڕێوەبردنن، توێژێك شیاوە بۆ کاری

پاراستن‌و بەرگری لە دەسەڵات، توێژی سێهەم زۆرینەی خەڵکە بۆ زۆربەی کارە جیاوازەکان دەشێن وەکو بازرگانی ئاسنگەری جوتیاری...هتد. ئەوەی لەم دابەشکاریەی ئەفلاتوندا سەرنجڕاکێشە ئەوەیە، کە گرنگی جیاوازی تاکەسی زانیوەو سودی لێوەرگرتوە بۆ داڕشتنی کۆمارەکەی،چونکە بنەمای دادوەری لای ئەمە بووە کە هەر چینێك ئەو کارە بکات کە بۆی ئامادەکراوەو بە خۆرسکی بۆی خولقاوە (هنیە، ۱۹۹۹،لا۳٤٧).

ئەرستۆش بەهەمان شێوە لە دیالۆگەکانیدا جیاوازی تاکایەتی پشتگوێ نەخستووەو ئەوەی خستۆتە ڕوو، کە جیاوازی لە نێوان کۆمەڵ‌و گروپەکاندا هەیە وەکو؛ جیاوازی لە نێوان نەژادو جیاوازی لە ڕوی کۆمەلایەتی جیاوازی لە نێوان هەردو ڕەگەزەکەدا (نێرو مێ) یان جیاوازی لە توانای هزری‌و ئاکاریدا.

### سەرەتاکانی جیاوازی تاکایەتی لای زانستی فەلەك ناسی

ئەوەی سەرسوڕهێنەرە ئەوەیە بابەتی جیاوازی تاکایەتی لەسەر دەستی زانای پەروەردەو دەروناسەکاندا نەدۆزراوەتەوە، بەڵکو لەسەر دەستی زانایەکی فەلەکی داهێنراوە. لە ساڵی(۱٧۹٦) کاتێك (ماسکلین) کە بەڕێوبەری چاودێری فەلەکی گرینش بووە یاریدەدەرەکەی دەردەکات کە ناوی (کینبرۆك) بووە لە ئیشەکەی بەهۆی ئەوەی کە ئەم ۱۸ چرکە جیاوازی هەبوە لە چاودێری ڕێرەوی ئەستێرەکان لەگەڵ ڕۆیاڵدا. بەڕێوبەرەکە وای دانا، کە ئەم جیاوازییە بەهۆی بێتوانایی کینبرۆکەوە دروست بووە. بەلام لە ساڵی (۱۸۱٦)دا زانای فەلەکی بەناوبانگ (بیزل) لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەو جیاوازییە کرد لە ئەنجامدا دەریخست، کە کەسەکان لەیەکتر جیاوازن لە ڕوی کاتی وەلامدانەوەیان بۆ وروژێنەرێك واتە ئەو کاتەی وروژێنەرەکە دەردەکەوێت‌و ئەو کاتەی کە وەلامی دەدەنەوە. خێرایی وەلامدانەوە بە واتای ئەو کاتەی کە

تیایدا وەلامدەدەنەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت. واتە کەسەکان جیاوازن لە خێرایی (کاتی گەڕاننەوە- زمن الرجع) ئەو جیاوازیەشی ناو ناوە(هاوکێشەی کەسێتی سەرنجدەرەکان). ئەگەرچی ڕێژەی جیاوازیەکە زۆر کەمە لە یەك دو چرکە زیاتر تێپەڕ ناکات لە نێوان سەرنجدەرەکاندا. بیزل ئەوەشی دەرخست کە جیاوازی کاتی سەرنجدان و وەلامدانەوەی لەوانەیە لەیەك کەسدا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر جیاواز بێت.

بەم دۆزینەوەیە دەرکەوت، کە هەڵەی ڕوداوەکەی گرینش بەهۆی جیاوازی تاکایەتیەوە دروستبووە. ئەمەش بەیەکەم پێوانەکردنی زمێرەیی دانرا بۆ جیاوازی تاکایەتی لە جیاتی تەنها سەرنجدانو بەزارەکی باسکردنی. ئەم ڕوداوە مێژوییە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا سەرنجی لێکۆڵەرەوانی ڕاکێشا بۆ پێوانەکردنی جیاوازی تاکایەتی. لەکاتێکدا کە دەرونناسانی ئەزمونگەری لە تاقیگەکانیاندا کاریان دەکرد ئامانجیان پێوانەکردن وسەرنجدانی جیاوازی تاکایەتی نەبوو. ئەوان ئەم جیاوازیانەیان وەکو هەڵەیەك لێکدەدایەوە، بۆیە لە کارەکانیاندا ئیشیان بۆ سڕینەوەی‌و کەمکردنەوەی دەکردو دەیانویست بگەن بە داڕشتنێکی گشتی یان یاسایەکی گشتی بۆ ڕەفتاری هەموو مرۆڤەکان. ئەمە دیدگای فۆنت بوو کاتێك لەساڵی (۱۸۷۹)دا یەکەم تاقیگەی لە شاری لیبزغ لە ئەڵمانیا دامەزراند.

## سەرهەڵدانی جیاوازی تاکایەتی لە زانستی بایلۆژیدا

لە دوای فۆنت خوێندکارەکەی (سیر فرانسیس گالتون) کە زانای بایلۆژی بوو، پێوانەکردنی جیاوازی تاکایەتی لەسەر بنەمایەکی ڕاستتر بەردەوامکرد. گالتۆن هەر لە منداڵیەوە زۆر بلیمەت بووە هەر لە سێ ساڵیەوە توانای خوێندنەوەی هەبووە، زۆر نزیك بوە لە زانای بەناو بانگ تشالز داروین کە کوڕی پوری بووە، گالتۆن گرنگی بە لێکۆڵینەوەی بۆماوەو هۆکارە بۆ

ماوەییەکان دەدا(لەگەڵ ئەوەشدا هۆکاری ژینگەیی پشتگوێ نەخستبوو)، بەڵام لە کاتی لێکۆڵینەوەکانیدا سەرنجی لە پێویستی شتێکی گرنگدا ئەویش پێوانەکردنی ئەو تایبەتمەندیانە بوو کە خزمەکان لە یەك نزیکدەخاتەوە (هاوشێوەیی)و لە هەمان کاتدا لە خەڵکانی تر جیایان دەکاتەوە (جیاوازی). بۆیە پێویستی بەوە بوو، کە زۆر بەوردی پەیوەندی نێوان خوشك‌و براو منداڵ‌و باوان وە دوانەکان(جمك) بپێوێت. گالتۆن زانیاری بێسنوری لە سەر جیاوازی تاکایەتی پێشکەش کردو چەندین پێوەری هزریشی داهێنا، کە تا ئێستاش کاریان پێ دەکرێت. ساڵی(١٨٨٢) تاقیگەیەکی دامەزراند بۆ پێوانەکردنی هەندێك دیاردە لای مرۆڤ، کە بە ئەنسرۆپۆمتری دەناسرێت. توانای پێوانەکردنی (تیژی چاو، بەهێزی بیستن‌و هەندێك لە ئەرکی هەست‌و جوڵەییە سادەکان) هەبوو. لە ئەنجامی سەرنجدانەکانی گالتون بەو ئەنجامە گەیشت، کە کەسانی گێل (Idiots) ناتوانن هەست بە سەرماو گەرماو ئازار بکەن.

گالتۆن یەکەم کەس بوو شێوەی ڕاپرسی بەکارهێنا (Questionnaires) لەگەڵ پێوەری پلە بەپلە(rating scale)و بەکارهێنانی دەربڕینی ئازاد (free association)، هەوڵی زۆری داوە بۆ پەرەپێدانی ئامرازە ئامارییەکان بۆ شیکردنەوەی ئەو داتاو زانیاریانەی لەسەر جیاوازی تاکایەتی بەدەستی خستبوو (الامارە، ٢٠١٤، لا ٢٠).

بافلۆف لە تاقیکردنەوەکانیدا توانی لای گیاندارانی ناو تاقیگەکەی بارێکی شڵەژانی دەرونیان تیادا دروستبکات، کە هاوشێوەی ڕەفتاری نەخۆشی دەماری بوو لای مرۆڤ (العصابی) واتە وەك بارێکی ترس و دڵەڕاوکێی مرۆڤ بوو، ناوی نا (نەخۆشی دەماری ئەزمونی)، لەکاتی ئەم تاقیکردنەوەیەدا سەرنجی ئەوەی دا کە گیاندارەکان وەکو یەك وەڵامدانەوەیان بۆ وروژێنەرە هاوشێوەکان نییە،

ئەمەش وای لە بافلۆف کرد تا تیۆرەکەی لەسەر جۆری مەزاجی مرۆڤ دابڕێژێت کە بەهۆیەوە دەیویست لە نەخۆشییە دەروونیەکانی مرۆڤ تێبگات، ئەو مەزاجی مرۆڤی بە پێی وەلامدانەوەی بۆ وروژێنەرە ژینگەییەکان کردووە بە چوار جۆرەوە، هەروەکو ئەوەی (ئەبوقرات) دیاریکردبوو. ئەویش جۆری بەلغەمی، جۆری خوێناوی، جۆری زەردباوی، جۆری ڕەشباوی بوو. ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە تۆوی جیاوازی تاکایەتی لەم دابەشبونەی بافلۆفدا شارراوەبوو هەر لەمەشەوە دیارە کە جیاوازی لە شێوازی بیرکردنەوەی زانینی مرۆڤەکاندا هەیە (ابراهیم،٢٠٠٨،لا٥٩).

## ڕۆڵی زانستی ئامار لە پەرەسەندی دەروونناسی جیاوازی تاکایەتیدا

لە کۆتایی چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا زانایەکی بەلجیکی بەناوی(کیتیلیە) چۆنیەتی دابەشکردنی سیفاتی مرۆڤی دۆزیەوە بەتایبەت سیفەتی بالا. ئەوەی دوپاتکردەوە کە دابەشبونی بالابەرزی‌و بالانزمی دابەشبونی سروشتی کاریگەرە، گالتۆن سودی لەم ئەنجامە وەرگرت ئەوەشیزانی کە ناکرێت زیرەکی بپوێرێت بێگەڕانەوە بۆ بەراوردکردنی بەناوەندی زیرەکی کەسانی تر.هەروەها گالتۆنیش ئەوەی دۆزیەوە کە هەموو سیفاتە عەقلییەکان دەچنە ژێر سایەی ئەم دابەشبونەوە کە کیتیلیە دۆزیەوە، هەروەها پێوەری ڕێژەی سەدی(Percentile) دۆزیەوە بەواتای ئەوەیە هەمو سیفەتێکی عەقلی پلە بەپلە بەرزدەبێتەوە.

## بژاڤی پێوانەی توانا عەقلییەکان

لەساڵی (١٨٩٥)دا هەردو زانا هنری‌و بینیە (Henri, Benet) کتێبێکیان بلاوکردەوە بەناوی (دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی تاکە کەس) تیایدا بۆ

یەکەمجار شیکردنەوەیەکی ڕێکوپێکیان پێشکەش کرد بۆ نامانجو بوارو پرۆگرامی دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی، دواتریش زانا ستِرن (Stern) لە ساڵی (١٩٠٠) کتێبێکی بڵاوکردووەوە بەناوی (دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی) تیادا لەسەر سروشتو کێشەکانی دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی نوسیبوی. لەساڵی (١٩٠٣) تۆمسون کتێبێکی دەربارەی جیاوازی ژنوپیاو بڵاوکردەوە، کە باسی تایبەتمەندییە هزریەکانی هەردو ڕەگەزەکەی کردبوو، و تیایدا پشتی بەستبو بەو پێوانەکاریە جۆراوجۆرانەی کە بۆماوەی چەند ساڵێك لەسەر ژمارەیەکی زۆر لە ژنانو پیاوان ئەنجامی دابوو، ئەوەش یەکەم لێکۆڵینەوەی زانستی بوو لەسەر دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی. (سلیمان،٢٠٠٥،ل٩٥). بەو جۆرەش دەروونناسی لە قۆناغی توێژینەوەی وەسفیەوە چووە قۆناغی توێژینەوەی ئەزمونگەری، بە تێپەربونی کات زیاتر گرنگیدا بە زانینی ئەو هەلومەرجانەی، کە تیایدا دەکرێت جیاوازی تاکایەتی گەشە بکات یان چاکسازی تیادا بکرێت.

ئیدی لەدوای ئەمەوە گرنگی بە جیاوازی تاکایەتی پەرەی سەند تا ڕۆژی ئەمرۆمان، ئەمە جگە لەوەی کە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەکی نیجگار زۆر لەبواری دەروونناسیو پەروەردەیدا ساڵانە ئەنجام دەدرێت. کۆمەڵە تۆڕێکی ئەنترنێتی دروست کراوە لە بواری جیاوازی تاکایەتیدا کاردەکات وەکو گروپی ڕۆزیدا (R.E.S.E.I.D.A) ساڵی (٢٠٠١)لە لایەن ئەلیزابێس باوتەرو جین یڤاس رۆچێکێس (Elizabeth Bautier & Jean Yves Rochex)، کە زیاتر جەخت دەکەنەوە لەسەر توێژینەوە لە بواری وانەوتنەوەو فێربوونو جیاوازی تاکایەتی لە فێربوندا. هەروەها گروپی (ئیسکول) (ESCOL) ساڵی (١٩٨٧) دامەزراوە لە لایەن باوتەرو کارلۆتەوە (Charlot&Bautier). کاردەکەن بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە؛ بۆچی هەندێك خوێندکار لە

قوتابخانەدا سەرکەوتوو نابن؟ بۆچی ئەم شکستە لای خوێندکارانی چینە هەژارەکان دوبارە دەبێتەوە؟ بۆچی هەندێك خوێندکار دەردەچن‌و هەندێکیش دەکەون لە تاقیکردنەوەکاندا؟ .

## گرنگی خوێندنی جیاوازی تاکایەتی

بۆچی جیاوازی تاکایەتی وەکو پرۆگرام دەخوێنرێت لە زانکۆکاندا؟

مرۆڤ چەند بەتوانا بێت ناتوانێت بە تەنیا بژی‌و واز لە کەسانی تر بهێنێت، بەڵکو مرۆڤەکان پێویستیان بە کۆمەك‌و هاوکاری یەکترە بۆ بونیاتنانی ژیانی مرۆڤانەی تەندروست. ئەگەر جیاوازی تاکایەتی کەسەکان پشتگوێ بخرێت ئەوا کاریگەری خراپ دروستدەکات لەسەر خۆی‌و لەسەر کۆمەڵیش، لێرەدا گرنگی جیاوازی تاکایەتی لەم خاڵانەدا دەخەینە روو:

١. گرنگی لە بواری بەکۆمەڵایەتیکردن‌و پەروەردەدا. لەبەرچاوگرتنی جیاوازییە تاکایەتییەکان یەکێکە لەبنەما سەرەکیەکانی دروستی دەرونی‌و پەروەردەیی، لەرێگەی دانان بە بێوێنەیی تاکەکانداو چۆنیەتی ئاراستەکردنیان و بەکارهێنانی ئەوپەری تواناو وزەکانی بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگاو سەرکەوتنی، لێرەوە پەروەردەی دروست ئەو پەروەردەیەیە کە وای دادەنێت تاکەکەس ئامانج‌و ئامرازیشە لە هەمان کاتدا. پێویستە تواناکانی بەکاربهێنرێت لە پێناو پرنسیپی یەکتر تەواوکردن‌و هاوکاریدا.

٢. گرنگیەکەی لە ئامادەکردنی تاکەکان بۆ هەموو جۆرە کارو پیشەیەکی تایبەت. تاکەکەس توانای ئەنجامدانی کارو پیشەیەکی تایبەتی زیاتر لە کارو پیشەکانی تر هەیە، ژیانیش پێویستی بە کارو لێهاتویی جۆراو

جۆره، كه یه‌كتر ته‌واو ده‌كه‌نو به‌یه‌كه‌وه هاوكارن، بۆ ئه‌مه‌ش پێویسته كه جیاوازی نێوان كه‌سه‌كان بدۆزرێته‌وه، هه‌لومه‌رجی له‌بار بۆ گه‌شه‌كردنی دابین بكرێت، جیاوازییه خۆڕسكو فێركراوه‌كان بوارێكی هێنده فراوانه بۆ شیاندنی پیشه‌یی بۆ هه‌مو جۆره كارو پیشه‌یه‌ك به‌و شێوه‌ی كه‌سه شیاوه‌كان ده‌خرێنه ناو كاره شیاوه‌كانه‌وه.

٣. **گرنگی ئاكاری:** ناسینی جیاوازی تاكایه‌تی بوار فه‌راهه‌م ده‌كات بۆ زیاتر ناسینی تاكه‌كانو تێگه‌یشتنیانو كۆبیرخستنه سه‌ر ڕه‌فتاره‌كانیان، ئێمه ناتوانین داوا له مرۆڤه‌كان بكه‌ین كه وه‌كو یه‌ك مامه‌ڵه‌مان بكه‌ن، چونكه هه‌مو كه‌سێك شێوازی خۆی هه‌یه له مامه‌ڵه‌كردنو هه‌ڵسوكه‌وتو هه‌ڵچونه‌كانیدا.

٤. **گرنگی بۆ خودی كه‌سه‌كان خۆیان:** جیاوازی تاكایه‌تی وا ده‌كات كه تاكه‌كان خۆیان زیاتر بناسنو زیاتر له خۆیان تێبگه‌نو بتوانن لێهاتوییو تواناكانیان بخه‌نه گه‌ڕ، به‌تایبه‌ت له قۆناغی پێگه‌یشتودا كه چه‌نده خۆی ڕۆشنبیر بكاتو تواناكانی بناسێت ئه‌وه‌نده ده‌توانێت ڕێگای سه‌ركه‌وتنو خۆشگوزه‌رانی بۆ خۆی والا بكات.

٥. **جیاوازی تاكایه‌تی گرنگه بۆ لێكۆڵینه‌وه له گه‌شه‌ی تاكه‌كان:** ده‌كرێت جیاوازی تاكایه‌تی به‌كار بهێنرێت بۆ ناسینی ئه‌و گۆڕانكاریانه‌ی به‌سه‌ر كۆمه‌ڵه كه‌سێكدا دێت، بۆ نمونه ئه‌گه‌ر بالای خوێندكاران له پۆلی سێهه‌مدا بپێوین وپاشان له قۆناغی شه‌شه‌مدا بالایان بپێوینه‌وه، ده‌بینین ناوه‌ندی ژمێره‌یی ڕێژه‌ی بلاویان(التشتت) جیاوازه ئه‌وش نیشانه‌یه بۆ ئه‌و گۆڕانكاریانه‌ی به هۆی گه‌شه‌وه ڕوده‌دات تیایاندا.

ئەم بابەتە گرنگە بخوێندرێت لە پێناوی ڕوبەروبونەوەی کێشە پەروەردەیی‌و کرداریەکانی منداڵ لە قۆناغە جیاوازەکانی خوێندنیدا، ئەویش بە ناسینی خواست‌و حەز وتواناو گرنگیپێدانەکانیان. یان خوێندنی ئەم بابەتە گرنگە لە پێناو پرنسیپی (کەسی شیاو بۆ کاری شیاو) دانانی کەسەکان بە پێی تواناو حەزەکانیان لە ئیش وپیشەکاندا، هەروەها لە ڕوی کلینیکیەوە ناسینی ئەو کەسانەی کە چاودێریەکی تایبەتیان پێویستە، وەکو ئەو منداڵانەی کە ئۆتیزیمیان هەیە یان لاوازی توانا عەقلیەکانیان هەیە یان توانای عەقلی زۆر بەرزیان هەیە.

لە ئەنجامدا دەتوانین بڵێین کە خوێندنی بابەتی دەرونناسی جیاوازی تاکایەتی گرنگی زۆری هەیە بۆ بوارە جۆراو جۆرەکانی ژیانمان وەکو: پەروەردەیی، کۆمەڵایەتی، پیشەیی، کە دەتوانین گرنگیەکەی لەم چەند خاڵەدا کورت بکەینەوە:

١.خوێندنی جیاوازی تاکایەتی هاوکارە بۆ ناسینی توانا شاراوەکانی تاکەکەسەکان.
٢. خوێندنی جیاوازی تاکایەتی هاوکارە بۆ ناسینی ئەو منداڵانەی خاوەن پێداویستی تایبەتن بۆ ئەوەی شێوازی پرۆگرامی تایبەت بەخۆی بۆ دارێژرێت‌و پیادەبکرێت بۆ فێربوونی.
٣. خوێندنی جیاوازی تاکایەتی هاوکارە بۆ مامۆستاو ستاف وانە ووتنەوەو فێربوون بۆ ئەوەی پرۆگرام‌و ئامانج‌و شێوازی وانە ووتنەو شێوازی ڕاهێنان لەگەڵ تواناو حەزو مەیلی خوێنکارەکان‌و پێداویستییە دەرونی‌و هەڵچونەکانی تایبەت بە قۆناغەکانی گەشەکردنیان وقۆناغە جیاوازەکانی خوێندن، بگونجێنن.

٤. هاوكاره بۆ دەركەوتنی تواناو ئامادەباشیو حەزی خوێندكارەكان، ئەمەش كاری ئاراستەكردنیان بۆ ئاینده بەرەو خوێندنە پیشەییەكان یان زانستیەكان ئاسانتر دەكات.
٥. خوێندنی جیاوازی تاكایەتی دەبێتە هۆی ناسینی سروشتی ڕەفتارەكان وهۆكارەكانی وتایبەتمەندی كەسێتی كە كەسەكەی پێ جیادەكرێتەوە.
٦. بەهۆیەوە دەتوانرێت پێشبینی ڕەفتاری خوێندكارەكە بكرێت لە هەڵوێستە جیاوازەكاندا، ئەوەش یارمەتی بڕیاردانی پێشوەختە دەدات، كە ئایا ئەو خوێندكارە سەركەوتوو دەبێت لەو هەڵوێستەدا یان نا.
٧. هاوكاره بۆ ئەوەی مامەڵەی كێشەكانی بە پێی تایبەتمەندی كەسەكە بكرێت (عودة، ١٩٩٣،ل٣٦٧).

بۆ مامۆستا زۆر گرنگە كە شارەزای دەروونناسی جیاوازی تاكایەتی بێت، چونكە بەهۆیەوە دەتوانێت بەسەر كێشەكانی خوێندكاران وانەوتنەوەدا زاڵ بێتو بە پێی پێویستی خوێندكارەكان مامەڵەیان بكات.

## چەمكی جیاوازی تاكایەتی

جیاوازی تاكایەتی دیاردەیەكی سروشتی وپێویستە بۆ بەردەوامبونی ژیانو ڕێكخستنی، تا بۆماوەو ژینگە وەكو دو فاكتەری سەرەكی كاریگەری بكەنە سەر گەشەی مرۆڤو ئەزمونەكانی ژیانی. ئەوا جیاوازی تاكایەتی هەر دروست دەبێت.

بۆ ماوەی زیاتر لە سەدەیەكە توێژینەوەو لێكۆڵینەوە لەسەر جیاوازی تاكایەتی زۆر بەباشی بەڕێوە دەچێت، زۆرترین بابەتێك كە لەژێر چەتری

جیاوازی تاکایەتیدا خۆی حەشاردابێت، زیرەکیو کەسێتیە وەك دوو سەرچاوەی جیاوازی ڕەفتار، ئەمەش وا دەکات کە جیاوازی تاکایەتی بوارێکی گرنگی دەرونزانی بێت، لەو کاتەی زۆرێك لە تیۆرە دەرونییەکان وای دادەنێن کە مرۆڤەکان یەکسانن، پاشان هەوڵ دەدەن کە خەسڵەتی گشتی ڕەفتاری مرۆڤەکان دیاری بکەن، بەڵام تیۆرەکانی جیاوازی تاکایەتی گرنگی بە جیاوازی نێوان تاکەکان دەدەن. یان گرنگی دەدەن بەو خەسڵەتانەی کە تاکەکان ناوازە و بێوێنە دەردەخات. بۆ نمونە لەوانەیە زانایانی دەرونناسی هەوڵی زانینی ئەوە بدەن ئەو پرۆسانە شیبکەنەوە کە بنەمان بۆ یادگای کورت مەودا، بەڵام ئەو زانایانەی لەبورای زیرەکیدا کار دەکەن بگەڕێن بۆ هۆکاری ئەوەی بۆچی هەندێك کەس یادگای کورت مەودای باشتریان هەیە لە کەسێکی تر. یان لەوانەیە زانایانی دەرونزانی کۆمەڵایەتی ئەوە شیبکەنەوە کە کەسەکان بۆ ملکەچی دەسەڵات دەبن، بەڵام تیۆرەکانی کەسێتی باس لەو هۆکارانە دەکەن کە وا دەکات کەسێك ملکەچتر بێت لە کەسێکی تر بۆ دەسەڵات.

دەرونناسە پەروەردەییەکان لەوانەیە لێکۆڵینەوە لەسەر کاریگەری دڵەڕاوکێ لەسەر فێربوون بکەن، بەڵام دەرونزانانی کەسێتی لەئەزمونی دڵەڕاوکێی کەسەکە دەکۆڵێتەوە کە پێیدا تێپەڕدەبێت. زانای دەرونناسی دەماری لەوانەیە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەوە بکات کە ئایا مادده هۆشبەرەکان کاریگەری دور مەودای لەسەر ئاستی شەڕانگێزی لای تاك هەیە یان نا؟ . بەڵام دەرونزانی جیاوازی تاکایەتی لەوە دەکۆڵێتەوە چ کەسێك پەنا بۆ بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان دەبات و لەبەر چی؟

ئامانجی دەرونزانی تاکایەتی دیاریکردنی لایەنە زۆر گشتگیرەکانە، کە بنەمان بۆ تاکایەتی کەسەکان، و چەمکی تیۆری دادەڕێژێت کە پێشبینی

جیاوازیو لەیکچوون لە بیرکردنەوەو هەڵچوونی ڕەفتاری مرۆڤەکاندا بکات. توێژەرانی بواری دەرونزانی تاکایەتی گرنگی بە شیکردنەوەی ئەوە دەدەن کە کەسەکان بۆچی لەیەکتر جیاوازن. دەیانەوێت بە شێوەیەکی فراوان لەو پرۆسە دەرونیانە تێبگەن کە ئەم جیاوازیانە دروستدەکات. کەواتە جیاوازی تاکایەتی پێوەرێکی زانستیە بۆ دیاریکردنی ئاستی جیاوازی تاکەکان لە سیفەتێك لە سیفەتە هاوبەشەکانی وەکو سیفەتی (هزری، جەستەیی، دەروونی)، واتە لادانی تاکەکەسە لە گروپەکەی لەو سیفەتەدا. یان لە ڕویەکی ترەوە جیاوازی تاکایەتی بریتیە لە جیاوازی هەر تاکە کەسێك لە کەسانی تر لە ڕوی تایبەتمەندیو خەسڵەتی هزریو جەستەییو دەرونییەوە.

لە کتێبەکەی دکتۆرە سنا محمد سلیماندا بەم شێوەیە پێناسەی جیاوازی تاکایەتی کراوە:" لادانی تاکەکەس لە ناوەندی کۆمەڵەکەی لە سیفەتە جیاوازەکاندا، لەوانەیە ئاستی ئەم جیاوازیە زۆر فراوان بێت یان کەم بە پێی ئاستە جیاوازەکانی هەر سیفەتێك لەو سیفاتانەی کە شیدەکرێنەوە ولێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێت (سلیمان،٢٠٠٦،لا٣١٧). ئەگەر ئەم پێناسەیە شیبکەینەوە بە واتای ئەوەیە کەجیاوازی مرۆڤەکان لە یەکتر لە ئاست وڕێژەی سیفەتەکەدایە نەك لە جۆری سیفەتەکەدا بێت. بۆ نمونە هەمو کەس باڵای هەیە وجیاوازی نێوان مرۆڤەکان لە بەرزی و کورتی باڵاکەدایە نەك لە هەبون یان نەبونی باڵادا(چونکە ئەمە مەحاڵە)،ئەگەر باڵای کۆمەڵێك خوێندکار بپێوینو ناوەندی ژمێرەییان بۆ دەربهێنین بکاتە(١٥٠)سم ئەو کاتە کەمتر یان زیاتر لەم ناوەندە بە جیاوازی تاکایەتی دادەنرێت.

بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤەکان تا ڕادەیەك لەیەك دەچن، بەڵام لە هەندێك تایبەتمەندیدا زیاتر لە چەند کەسێکی تر دەچن، لە هەندێك تایبەتمەندی

تریشدا له هیچ کەسێك ناچن تەنها خۆیان نەبێت(ئەمەیە نهێنی بونو ژیانە کە تۆ لە هیچ کەس ناچیتو هەر خۆتی بەتەنیا لەم جیهانەدا کە لە خۆت بچیت). ئەم دەربڕینە واتای جیاوازی تاکایەتی زۆر بەڕونی دەردەخات، هاوشێوەیی بە واتای یەکسانی ویەکبون نییە، ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا هاوشێوەیی هەیە لەهەمان کاتدا جیاوازیشی هەر هەیە، ئەم جیاوازی وهاوشێوەیی بونە تەنها لە نێوان تاکەکەسەکاندا نییە، بگرە لە نێوان کۆمەڵگاو گروپەکانیشدا هەیە. وەکو جیاوازی لە نێوان بەرەبابەکانو جیاوازی لە نێوان توێژە کۆمەڵایەتیەکاندا، ئەمە جگە لەوەی، کە جیاوازی لە تایبەتمەندیو سیفاتەکاندا لە خودی کەسێکیشدا لە قۆناغێکی تەمەنەوە بۆ قۆناغێکی تری تەمەن دەگۆڕێت (عیاش،٢٠٢٠).




بۆیە پرۆسەی دۆزینەوەی جیاوازی تاکایەتی بەشێویەکی سەرەکی پشت دەبەستێت بە دیاریکردنی سیفەتەکە، کە دەمانەوێت لیکۆڵینەوەی لەسەر بکەین جا ئیتر سیفەتێکی جەستەییە، هزری، هەڵچونی یان شتێکی ترە، پاشان ئاستی ئەو کەسە لەو تایبەتمەندیەدا دەپێوین. لەوانەیە ماوەی نێوان جیاوازیەکە زۆر بێت یان کەم ئەوەش بەپێ جۆری دابەشبوونی سیفەتەکە دەگۆڕێت.



پێناسەی جیاوازی تاکایەتی بە پێی فەرهەنگی دەروونناسی شیکاری دەروونی واتا "ئەو جیاوازییە جەستەیی‌و هزری‌و دەروونیانەیە، کە کەسێك لەوەی تر جیا دەکاتەوە" ئەم کەسە زیرەکترە لەوەی تر، ئەم کەسە کەمتر کەسێکی داخراوە لەوەی تر، فلانە کەس بالآی بەرزترە لە فلان. دەبێت ئەم تایبتمەندیانە بناسین تا بتوانین مامەڵەی هەر کەسێك بە پێی خۆی بکەین. مامەڵەو خۆگونجاندنمان لەگەڵ کەسێك نەخۆشی دەروونی هەبێت یان لە ڕوی زیرەکیەوە کەم توانا بێت جیاوازە وەك لە کەسێکی تەندروست لەڕوی دەروونیەوە. هەمومان لێهاتویەکی خۆڕسکمان هەیە بۆ مامەڵەکردنی کەسە جیاوازەکان بە پێی سیفەتەکانیان، ئەمەش وامان لێدەکات هەر کەسێك لە ئێمە کەسێتیەکی بێوێنەو تاك بنوێنێت، هەر ئەمەش گرنگی دەدات بە لێکۆڵینەوەی جیاوازی تاکایەتی بە شێوەیەکی زانستی وەکو پرۆسەی ڕێکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان‌و دابەشکردن‌و بەڕێوەبردنی کارو پیشەو ڕۆڵە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵ، ئەگەر جیاوازی تاکایەتی نەبێت ئەوا پێویستیمان بە پێوەرە دەروونی‌و پەروەردەییەکان نابێت.) مأمون، ٢٠٠٨.٨٠).

هەروەها هەندێك پێناسەی جیاوازی تاکایەتی هەیە کە لەسەر بنەمای کەسێتی داڕێژراون لەو پێناسانەش پێناسەی **محمود عبد الحليم منس** لە کتێبەکەیدا بەناوی (دەروونناسی پەروەردەیی) بەم جۆرە پێناسەی کردووە: "

جیاوازی تاکایەتی دیاردەیەکی گشتییە لە دیاردە جیاوازەکانی کەسێتی، چەمکی کەسێتیش پشت دەبەستێت بەو بەڵگە نەویستەی کە، هەمو مرۆڤێك بۆ خۆی بێوێنەیە، بەو جۆرەش نابێت لە کەسانی تر جیاواز نەبێت "(منس،ب،ت،لا١٣٧).

(ئانریك) لە بۆچونی کەسێتیەوە جیاوازی تاکایەتی بەم شێوەیە پێناسە دەکات: "بریتییە لە ڕێکخستنێکی ڕێژەیی‌و جێگیرو هەمیشەیی، کە لە سروشت‌و مەزاج‌و پێکهاتەی هزری تاکەکەسدا هەیە بەهۆیانەوە شێوازی تایبەتی خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگەدا دادەڕێژرێت، واتە مرۆڤ بەو کۆمەڵە تایبەتمەندییە دیارو شاراوە جیاوازانەوە وای لێدێت کە ڕەفتارو مامەڵەی جیاواز لە کەسانی تر بنوێنێت (القزاق، ١٩٩٣، لا ١٥). هەروەها بەم جۆرەش پێناسە کراوە کە بریتیە لەو جیاوازیانەی، کە لە نێوان کەسەکاندا دەبینرێتەوە لەڕوی خەسڵەتە جیاوازەکانەوە وەکو هەڵچونی وهزری ئەویش جیاوازییە لە نمرەدا نەك لە جۆردا (لە چەندێتیدا نەك چۆنیەتیدا). (دەرونناسە ڕوسەکان بڕوایان وایە، کە جیاوازی نێوان کەسی بلیمەت‌و کەسی کەمتوانای هزری تەنیا لە نمرەدا نییە بگرە جیاوازییە لە ئاڵۆزی تواناکە وپێکهاتەکانی(الشیخ، ٢٠١٤، لا٢٣).

پێویستە ئەوەش بزانین کە جیاوازی تاکایەتی تەنها دیاردەکانی کەسێتی ناگرێتەوە بگرە ئەوەش تێدەپەڕێنێت بۆ جیاوازی شێوازی فێربوون‌و شێوازی بۆچون بۆ ژیان‌و زۆر ڕەهەندی تری پەیوەست بە ژیانی مرۆڤەوە.

## جۆرەکانی جیاوازی تاکایەتی

جۆرەکانی جیاوازی تاکایەتی لە زۆربەی ئەو دیاردانەی کە پەیوەستن بە مرۆڤەوە دەردەکەوێت وەکو لایەنی ڕەفتارو پەروەردەیی‌و کەسێتی. زاناکان دوو جۆری جیاواز لە جیاوازی تاکایەتیان پۆلێن کردووە ئەوانیش؛ جیاوازی

له پله یان ئاست یان نمره لەگەڵ جیاوازی له جۆردا، جیاوازی له جۆردا ئەو جیاوازیەیە لە نێوان دوو خەسڵەتی جیاوازدا وەکو باڵا وکێش کە ناتوانین بەراورد لەنێوان ئەم دوانەدا بکەین، چونکە یەکەی پێوانەی هاوبەشمان نییە بۆ هەردوکیان بەیەکەوە، وەکو دەزانن باڵا بە سانتمەتر دەپێورێت و کێشیش بە کیلۆگرام.

له بواری دەرونیشدا جیاوازی لە نێوان زیرەکی وهەڵچونی جیاوازییە لە جۆری خەسڵەتەکەدا، ناتوانین بەراوردی زیرەکی وهاوسەنگی هەڵچونی بەیەکەوە بکەین، چونکە یەکەی پێوانەکردنی هاوبەشمان نییە بۆیان.

جیاوازی نێوان تاکەکان لە یەك خەسڵەتدا، ئەوە جیاوازیە لە پلە یان نمرەدا نەك جیاوازی بێت لە جۆردا. بۆ نمونە جیاوازی کەسی باڵابەرزو باڵاکورت جیاوازیە لە نمرەدا، چونکە ئاستی جیاوازی باڵامان هەیە. دەتوانین بەراوردیان بکەین بەیەك یەکە دەپێورێن. ئەمە سەبارەت بە خەسڵەتی زیرەکیش بە هەمان شێوەیە جیاوازی نێوان بلیمەت و کەمتوانای هزری هەر لە نمرەی زیرەکیدا(الشیخ، ٢٠١٤، لا٢٣٢)

بەشێویەکی گشتی جۆرەکانی جیاوازی تاکایەتی لەزۆربەی سەرچاوەکاندا بەم جۆرانەی لای خوارەوە دەست نیشانی کردوە:

١. **جیاوازی نێوان کەسەکان:** واتای جیاوازی تاکە کەسەکان لەیەکتر لە ڕوی توانا و تایبتمەندیەوە بەئاستێکی بەرز یان نزم یان مامناوەند، ئامانجی پێوانەکردنی ئەم جیاوازیانە ئەوەیە، کە بەراوردی کەسێك بە کەسانی تری ناو گروپەکە بکات کە لە گەڵیدان وەکو؛ هاوپۆلەکانی یان هاوتەمەنەکانی یان هاوڵاتییەکانی لە ڕوی سیفەتێکی دەرونی، پیشەیی یان پەروەردەییەوە بۆ ئەوەی پێگەی ڕێژەیی یان ئاستی کەسەکە دیاریبکرێت لە نێویاندا، بەوەش تاکەکان پۆلێن دەکرێن.

هەمو خوێندکارێك بەرێژەیەك جیاوازی هەیە لە تایبەتمەندیو ئەرکە جیاوازەکاندا، لە هەمو قۆناغەکانی خوێندندا ئەو جیاوازیانە بەڕونی هەست پێدەکرێت لە نمرەی وانەکانیدا لەگەڵ جیاوازی لە لێهاتوییو تواناکانیدا وەکو توانای وەرزشی، زمانەوانی، هونەری...هتد.(الخالدي، ٢٠١٣، ص٢٠).

٢. **جیاوازی تاکایەتی لەنێو خودی تاکەس خۆیدا:** هەمو کەسیك بە پێی قۆناغە جیاوازەکانی گەشەکردنی گۆڕانکاری لە ئەرکە سەرەکییە دەرونی وجەستەییەکانیدا ڕودەدات، ئەم گۆڕانکاریانە بە ئاسانی سەرنج دەدرێتو دەپێورێت، ئەگەر مرۆڤ هەر لە دایکبونیەوە تا مردن هەروەکو خۆی بوایە ئەوا ئەو هەمو زانیاریانەمان لەسەر گەشەی منداڵ لا دروست نەدەبوو (الخالدي، ٢٠١٣، ص٢٠).

هەر لەدوای لەدایك بونەوە ئەگەر شتێك بەسەر منداڵدا ڕوبدات کاریگەری لەسەر دروستبونی کەسێتیەکەی دەکات لە ئاییندەدا، ئەوەی کۆنترۆڵی ئەم گەشەکردنە دەکات هۆکارگەلێکی زۆر زۆرە کە بەپێی جیاوازی کەسەکەو ژینگەکەی دەگۆڕێت.

ئەو تایبەتمەندیانەی لە خودی کەسەکەدا جیاوازە؛ وەکو ئەوەی کەسێك لە ڕوی هزریەوە زیرەك بێت، بەڵام توانای میکانیکی لاواز بێت.لە ڕوی جەستەییەوە باشو تەندروست بێت، بەڵام بیستنو بینینی لاواز بێت. لە قوتابخانەدا ئەمە زۆر بەباشی هەستی پێدەکرێت خوێندکارێك لەوانەیە لە بیرکاریدا زۆر زیرەك بێت، بەڵام لە مێژو وکۆمەڵایەتیدا لاواز بێت. لەوانەیە هەر لە بابەتی وەکو وەرزشدا خوێندکارەکە زۆر لێهاتویی باشی هەبێت بۆ تۆپی پێ، بەڵام بۆ تۆپی دەست بەو شێوەیە لێهاتوو نەبێت. تایبەتمەندیەکان کاریگەریان هەیە لەسەر ڕەفتار وەەیلەکان لە هەمان کاتدا کاریگەری لەسەر

لێهاتوییەکان دروستدەکات. واتە جیاوازی سیفات وتایبەتمەندیەکان لە یەك کەسدا لەڕوی لاواز و بەهێزیەوە. ئامانج لێی ناسینی ئەو پەڕی تواناکانی تاکەکەسە بۆ ئەوەی بتوانرێت پلانی خوێندن وپەروەردەیی گونجاوی بۆ دابنرێت، دواجاریش بتوانرێت بخرێتە کارو پیشەیەکەوە کە لەگەڵ تواناکانیدا هاوتا بێتەوە. ئەوپەڕی سود لە تواناکانی وەربگیرێت.

٣. **جیاوازی نێوان پیشەکان:** پیشە جیاوازەکان پێویستیان بە تواناو لێهاتویی‌و تایبەتمەندی جیاواز هەیە، پێوانەکردنی ئەم جیاوازیانە سودیان هەیە بۆ هەڵبژاردنی کەسەکان بۆ ئەو پیشەیەی کە بۆی دەگونجێت لەلایەکی تریشەوە، سودی دەبێت بۆ ئامادەکردنی کەسەکان بە پێی پیشەکان.

٤. **جیاوازی نێوان گروپەکان:** گروپەکان لەگەڵ یەکتر جیاوازن لە ڕوی تایبەتمەندی‌و خەسڵەت‌و باری مەزاجی‌و ڕەفتاری‌و عەقڵی‌و تونای بەرگەگرتنیانەوە. پێوانەکردنی جیاوازی نێوان گروپەکان هاوکاریمان دەکات بۆ لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی دەروونناسی گەشەو تایبەتمەندی ئەو هۆکارانەی کاریگەریان هەیە لەسەر دروستبونی ئەم جیاوازیانە، ئەگەرچی جیاوازی نێوان گروپەکان لەگەڵ جیاوازی نێوان تاکەکان لە یەك ناچن. هەروەها جیاوازی نێوان ڕەگەزەکانیش (نێر و مێ) وەکو جۆرێکی جیاوازی گروپەکان دادەنرێت کاتێك پێوانەی توانا عەقڵیە زاڵەکان دەکرێت. لێکۆڵینەوەی زۆر ئەنجام دراوە لەم ڕووەوە کە هەندێك جیاوازی زۆر زەق دەخەنە ڕوو لەوانەش:

## جیاوازی ڕەگەزی لە پێکهاتەی توێکلی مێشکدا:

ا. لە توێکڵی مێشکی نێرینەدا ژمارەی خانەکانی زیاترە، بەڵام لە توێکڵی مێشکی مێینە بەیەکەوە گرێدراوی خانەکان زیاترە.

ب. **جیاوازی لە قەبارەی هەندێك بەشی جیاواز لە توێکلی مێشکدا،** جیاوازی لە بەکارهێنانی ووزەدا. زاناکان ئەوەیان تۆمار کردوە هەندێك ناوچەی مێشکی نێرینە گەورەترە لە مێشکی مێیەنە. لەبەرامبەردا هەندێك ناوچەی تری جیاواز هەیە لە مێشکی مێینەدا کە گەورەترە لە مێشکی نێرینە.



ئەوەش سەلمێنراوە کە تێکرای بەکارهێنانی مێشك بۆ کلیکۆز لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازە لای هەردو ڕەگەزەکە(١٧ ناوچە)یە. هەندێك ناوچە لای ژنان زۆرتر کلکۆز بەکاردەهێنێت، بەڵام لای پیاوان هەندێك ناوچەی تر زیاتر کلیکۆز بەکاردەهێنێت.

ج. **جیاوازی ڕەگەزی لە ڕوی ناوچەو ئیشو کارەکانی توێکلی مێشکەوە.** ئەوە سەلمێنراوە، کە ئەو سەنتەرانەی بەرپرسن لە ئیشو کاری جیاواز لە مێشکی پیاواندا زۆر ئاشکراو ڕونە. واتە بۆ هەر ئەرکێکو ئیشێکی مێشك سەنتەرێکی خۆی هەیە کە لە شوێنەکانی تری مێشکەوە تەشویشی ناچێتە سەر. سەنتەری بیرکردنەوەی مەنتقیو عەقلانی لە

لایەن سەنتەری بیرکردنەوەی سۆزداریەوە هێندەی ژنان تەشویشی ناچێتە سەر.

پەیوەندی نێوان هەردو نیوە گۆی مێشك لە ڕێگەی (Corpus Callosum)وە کە پشتێنەیەکی ساف فراوانی دەماری سپیە، کەوتۆتە ژێرتویکلی مێشك لەناوەڕاستی هەردو نیوەگۆی مێشکدایە بەشێوەیەکی ستونی چەند سانتیمەترێك لە پێشەوە بۆ دواوەدێت، ئەمە گەورەترین هەیکەلی مادده سپیەکەیە لە مێشکدایە، کە لە ملیۆنان تۆڕی دەماری پێك هاتووە کە هەردو نیوە گۆکە بەیەکەوە گرێ دەداتەوە پەیوەندی نێوانیان ئاسان تر دەکات زانیاری نێوانیان لە شێوەی تەزوی کارەبایدا دەگوێزێتەوە(ویکبیدیا). ئەم بەشە (Corpus Callosum) لە لای ژنان زۆر چالاکترە وەك لای پیاوان.




توێژینەوەکانی سەدەی بیستەم ئاماژەیان بەوە کردوە کە قەبارەی ئەم بەشە جیاوازە لە نێوان ژنو پیاودا، بەڵام توێژینەوە تازەکان ئەوەیان دوپاتکردوە کە لەڕوی شێوەوە هەیکەلو لەڕوی مایکرۆسکۆبیشەوە جیاوازن. بەتایبەت ناوچەی نیوە تیرەیی کۆرپس کولیسیۆم لای ژنان گەورەترە وەك لە پیاوان(ویکیبیدیا)

د. ئیش‌و کارەکانی نیوە گۆی ڕاست‌و چەپی مێشك لە ژن و پیاودا جیاوازە. لەهەر نیوە گۆیەکی مێشکدا کام ئیش وکار جێدەگرێت، جیاوازی هەیە وەکو لە خوارەوە ڕون دەکرێتەوە:

١. کارو ئیشی یادگا: لە لای هەردو ڕەگەزەکە ئەرکی یادەوەری دەکەوێتە بەشی پێشەوەی فرۆنتاڵ (Frontal)و بەشی پەرینتاڵ( Parietal lobe) لە هەردو نیوە گۆکەدا. لای پیاوان وەکو یەك لە هەردو نیوەگۆکەدا دابەش بووە. یان دەکەوێتە بەشی سەرەوەی نیوەگۆی لای ڕاست. بەڵام لای ژنان کاری وئیشی یادگا دەکەوێتە بەشی سەرەوەی نیوە گۆی چەپەوە (شریف و کامل،٢٠١١، لا ٥٦)

٢. ئەرك و کاری زمان: زاناکان دوجۆر کار لە بورای تواناکانی زمان لەیەك جیا دەکەنەوە، ئەرکی یەکەم بریتیە لە ئالیاتی زمان ئەوانیش؛ ئالیەتی وتنی وشەو پیتەکانە، واتە قسەکردن. ئەرکی دووەم بریتیە لە سەرمایەی زمانەوانی واتە ژمارەی زارەوەکانی کە دەیزانێت و بەکاری دەهێنێت و واتاکەی تێدەگات.

توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە هەردوو ئەرکەکە لای پیاوان لە بەشی پێشەوەوە و بەشی دواوەی نیوەگۆی لای چەپی مێشك چڕبۆتەوە. بەڵام لای ژنان ئالیات زمان لەبەشی پێشەوەی نیوەگۆی لای چەپ مێشك تەنها چڕبۆتەوە، بەڵام سەرمایەی زمانەوانی بەسەر بەشی پێشەوەو دواوەی هەردو نیوەگۆی لای ڕاست‌و لای چەپیش دابەش بووە. سەرباری ئەمەش ژمارەی خانە دەمارییە بەرپرسەکان لە زمان‌و بیستن لای ژنان زیاترە بە ڕێژەی١١٪. ئەمەش ئەوە ڕون دەکاتەوە کە ژنان بۆ بیستن‌و فێربوونی زمان توانایان باشترە لە پیاوان.

٣. توانای شوێن ناسین (درکردن بە ڕەهەندەکانی سەرەو خوارەوە، پێشەوەو دواوە، لای ڕاستو لای چەپ): کاتێك پیاو نەخشەی جوگراف دەخوێنێتەوە، ئەوا لەو کاتەدا چالاکیەکی زۆرتر لەبەشی نیوەگۆی ڕاستدا دەبینرێت واتە زیاتر خوێن بۆ ئەو بەشە دەچێت. بەڵام لای ژنان ئەو چالاکییە بە یەکسانی بەسەر هەردو نیوە گۆی مێشکیدا دابەش بووە.

هەر لەبەر ئەوەی ئەم توانای درککردنی شوێنە لای پیاوان بەتەنها لە نیوەگۆی چەپدا چڕبۆتەوە ئەوە وای کردوە، کە ئەوان بەتواناتر ولێهاتوو تر بن لە ناسینەوەی شوێن وخوێندنەوەی نەخشەی جوگراف وهەندێك کاروباری ئەندازیاری کە پەیوەندی بەشوێنەوە هەبێت.

٤. هەست وهەڵچونەکان: سەنتەری هەستەکان لە مێشکی پیاواندا لە نیوەگۆی ڕاستدا چربۆتەوە، بەڵام لای ژنان لە هەردو نیوەگۆی ڕاستو چەپدا دابەش بووە.

تاڕادەیەك بێتوانایی پیاوان لەدەربڕینی هەستەکانیاندا بۆ ئەوە دەگەڕیتەوە کە سەنتەری هەستەکانیان لە نیوە گۆی ڕاستە وسەنتەری زمانیش لە نیوە گۆی چەپە، بەڵام لای ژنان سەنتەری زمان وهەستەکانیش بەسەر هەردو لای نیوە گۆی ڕاستو چەپیشدا دابەش بووە. بۆیە ژنان دەتوانن زۆر بەخێرایی هەستەکانیان بە ووتن دەرببڕن(شریف و کامل،٢٠١١، لا ٥٩).

دەتوانین لەم خشتەیەی خوارەوەدا دابەش بونی تواناکان بەسەر نیوە گۆی ڕاستو چەپدا لای ژنانو پیاوان ڕون بکەینەوە.

| ئەرك و كاری مێشك | كام لای مێشك و شوێنی چڕبونەوەی ئەركەكە | |
|---|---|---|
| | پیاوان | ژنـان |
| یادگا | وەكو یەك لە هەردو نیوەگۆكەدا دابەش بووە | سەرەوەی نیوەگۆی لای چەپ |
| ئالیاتی زمان(قسەكردن) | نیوەگۆی چەپ: پێشەوەوە و دواوە | نیوە گۆی چەپ لە پێشەوەی |
| سەرمایەی زمانەوانی | نیوەگۆی چەپ: پێشەوەوە و دواوە | لە هەردو نیوەگۆی چەپ و ڕاستدا دابەش بووە لە پێشەوە و لە دواوەش |
| توانای درككردنی شوێن | نیوە گۆی ڕاست | نیوە گۆی ڕاست و چەپ |
| هەست و هەڵچونەكان | نیوە گۆی ڕاست | نیوە گۆی ڕاست و چەپ |

هـ. جیاوازی ڕەگەزی لە شێوازی بیركردنەوە: تا سەرەتای سەدەی بیستو یەكەم ئەوە نەزانرابوو كە ژنانو پیاوان بەڕێگای. جیاواز بیردەكەنەوە، لە كاتی بیركردنەوەدا شانەی دەماری جیاواز بەكار دەهێنن.

ئەو توێژینەوانەی دكتۆر (ریچارد هایەر) لە زانكۆی كالیفۆرنیا لە ساڵی(٢٠٠٦)ئەنجامی دابوو ئەوەی دەرخست، كە قەبارەی مادده ڕەساسیەكە(خانە دەماریەكان) كە بەرپرسە لەسەر تاوتوێكردنی زانیاری لە كاتی پرۆسەی بیركردنەوەدا لە لای پیاوان بە ڕێژەی شەشو نیو هێندە زیاترە وەك لە ژنان، بەڵام مادده سپیەكە(واتە تۆڕی دەماری) كە بۆ ئاڵوگۆڕی

زانیاری بەکاردەهێنرێت لەکاتی بیرکردنەوەدا لای ژنان زۆر چڕترە بە ڕێژەی دە هێندە بەبەراورد بە پیاوان. واتا پیاوان لەکاتی بیرکردنەوەدا پشت بە تاوتوێی زانیاری دەبەستنو ژنان پشت بە ئاڵوگۆڕی زانیاری دەبەستن لە نێوان ناوچە جیاوازەکانی مێشکدا، بە پشت بەستن بەم ڕاستیە، توێژەران سەرکەوتنی پیاوانیان شیکردۆتەوە لەو ئەرکە عەقڵیانەی کە پێویستی بە تاوتوێکردنی زانیاری ڕوتە وەکو بیرکاری بەبەراورد بە ژنان کە سەرکەوتووترن لەو ئەرکانەی کە زیاتر پێویستی بە ئاڵوگۆڕی زانیاریە لە نێو ناوچە جیاوازەکانی مێشکدا وەکو (زمان).

**سێهەم: جیاوازی ڕەگەزی لە سیستمی لمبکدا**(Limbic System):
ئەمیگدالا سەنتەری عەقڵی هەڵچونیو سۆزداریە هەروەها یادگای هەردوکیشیانە لە مێشکدا، یەکێکە لە پێکهێنەرە گرنگەکانی سیستمی لمبیك، زاناکان لە ئەنجامی توێژینەوەکانیان بەو ئەنجامە گەیشتون، کە ئەمیگدالا لەژنان وپیاواندا جیاوازە لە ڕوی چالاکیو بونیادیشەوە. لە خوارەوە ئەم جیاوازیانە ڕون دەکەینەوە:

١. بەشێوەیەکی گشتی ئەمیگدالا لە نێرینەدا قەبارەکەی گەورەترە وەك لە مێیەنەدا.
٢. ئەمیگدالای ڕاست چالاکترە و پەیوەندی زیاتری بە سەنتەرە جیاوازەکانی مێشکەوە هەیە لە نێرینەدا، بەڵام لای مێینە ئەمیگدالای چەپ چالاکترو زیاتر پەیوەندی بە بەشە جیاوازەکانی مێشکەوە هەیە.
٣. ئەمیگدالا لای نێرینە زیاتر پەیوەندی بەدەرەوە هەیە، ئەو زۆربەی ئاماژەکانی لەو سەنتەرە هەستیانەوە وەردەگرێت کە گرێدراون بە ناوەندەوە (وەکو سەنتەری بیستن وبینین)و فەرمانەکانیشی دەدات

بەو سەنتەرانەی بە ناوەندەوە بەستراون وەکو سەنتەری جوڵە، بەڵام لە مێینەدا پەیوەندیەکانی ئەمیگدالا زۆر لەگەڵ ناوەوە زیاترە، زۆر گرێدراوە بە سەنتەری هەستە ناوەکیەکانەوە.

٤. زاناکان ئەوەشیان دۆزیوەتەوە، ئەو بەشانەی سیستمی لمبیك کە کەوتۆتە بەشی تیمپورالەوە (Temporal lobe)لای نێرینە زۆر چالاکترە، ئەم ناوچانە بەرپرسن لە وەڵامدانەوەی ماسولکەییەکان، بەڵام لە مێینەدا ئەو بەشەی بەرپرسە لە وەڵامدەرەوە دەروونییەکان کە بە (Cortex cingularis، التلفيف الحزامى)ناسراوە ئەو زۆر چالاکترە، ئەمە ئەوە شیدەکاتەوە کاتێك ژنان هەڵدەچن زیاتر بە قسەکردن هەڵچونەکانیان دەردەبڕن، بەڵام وەڵامدانەوەی هەڵچونی لای پیاوان زیاتر بە بەکارهێنانی ماسولکەیە وەك بۆکس و زللە.

٥. ناوچەی هایپۆکەمەپەس(Hippocampus) کە بەرپرسە لە یادەوەری هۆشیار لە سیستمی لمبیکدا لە ژناندا قەبارەی گەورەترەو چالاکترە وەك لە پیاوان.

سێهەم: جیاوازییە ڕەگەزیەکان لە ناوچەی هایپۆسەلامۆس: توێژینەوەکان ئەوەیان سەلماندوە، کە سەنتەری دەماری بەپرس لە ڕەفتاری سێکسی لە ناوچەی هایپۆسەلامۆس لە لای نێرینە دوهێندە و نیو گەورەترە وەك لەلای مێینە.

چوارەم جیاوازی ڕەگەزی لە پێنج هەستەکەدا: ئەگەر بە بیستن دەست پێ بکەین، دەبینین، کە مێینە توانای بیستنیان زۆر باشترە وەك لە نێرینە، ئەو توانایەشە وایان لێدەکات کە گریانی ساواکەی ببیستێت لە شەودا.

سەبارەت بە بینین ژنان لە تاریکیدا باشتر دەبینن وەك لە پیاوان، هەروەها هەستیار ترن بۆ ڕەنگی سور و هاوڕەنگە نزیکەکانی(ئەم ڕەنگە شەپۆل درێژەکانن، ئەم توانایەش هاوکاریان دەکات کە زۆر زوو هەر سوربونەوەیەك لەسەر پێستی منداڵەکەیان دروست بوو، ببیبنن. بەڵام پیاوان لە بینینی ڕەنگی شین و ڕەنگە نزیکەکان لە شین لێهاتووترن. سەبارەت بە ناوچەی بینین، ژنان توانای بینینی ناوچەیەکی فراوانتریان هەیە لە ئەوپەڕی ڕاستەوە تا ئەوپەڕی باکوری ئەو ناوچەیەی بەرامبەریەتی، بەڵام پیاوان دەتوانن وردەکاری زیاتر ببینن لە ناوچەیەکی تەسکترداو بۆ ئەو ناوچەیەی کە ڕاستەوخۆ بەرامبەریەتی.

سەبارەت بە هەستی دەست لێدان یان بەرکەوتن ژنان دە هێندەی پیاوان هەستیار ترن بۆ بەرکەوتن. هەتا ژنێکی زۆر کەم هەستیار لە پیاوێکی زۆر هەستیار، هەستیارترە بۆ دەست لێدان وبەرکەوتن. لە هەمان کاتدا ژنان توانای بەرگەگرتنی ئازاریان هەیە بۆ ماوەی درێژتر لە پیاوان وەکو بەرگەگرتنی ئازاری دوگیانی.

سەبارەت بە هەستی تام یان چەشتن، ژنان بۆ تامکردنی تامی تاڵ هەستیارترن وەکو مادەی(کینین)، هەروەها بۆ شیرینی زیاتر حەزیان لە شیرینیە. بەڵام پیاوان زیاتر حەزیان لە سوێریە. بەشێوەیەکی گشتی ژنان توانای چەشتنی باشتریان هەیە کە هاوکاریان دەکات بۆ تامکردنی ئەو خواردنانەی کە دەیدەن بە منداڵەکانیان. لەگەڵ ئەوەی کە ژنان هەستیارترن بۆ بۆن کردن (شریف و نبیل،٢٠١١، لا ٦١).

## بەشی دووەم

- ئامانجی جیاوازی تاکایەتی
- سیفەتە گشتیەکانی جیاوازی تاکایەتی
- هۆکارەکانی جیاوازی تاکایەتی
- دابەشبونی جیاوازی تاکایەتی
- پێوانەکردنی جیاوازی تاکایەتی

## ئامانجی جیاوازی تاکایەتی

جیاوازی تاکایەتی ئامانجی ئەنجامدانی توێژینەوەی زانستیە لەسەر جیاوازی نێوان تاكو گروپەکان، جا ئەو جیاوازییە لە تایبەتمەندییە جەستەیی، عەقڵی، هەڵچونییەکان بێت یان لە لایەنە جیاوازەکانی کەسێتیدا بێت. توێژینەوە بەئامانجی زانینی مەودای جیاوازیەکانو ئەو هۆکارانەی دروستیدەکات، لەگەڵ کاریگەری هەردو هۆکاری ڕاهێنانو گەشە لەسەر دروستبونی جیاوازی تاکایەتی، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی زانستی وەکو:

١. ڕوپێوی: لێکۆڵینەوەیەکی زانستی گشتگیرە بۆ هەمو ئەندامانی کۆمەڵگا لە شار لە لادێ، بە ئامانجی دەرخستنی وێنەیەکی تەواو وگشتگیر لەسەر دیاردەکە کە لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکرێت. بۆ نمونە: لێکۆڵینەوە لەسەر ئاستی زیرەکی، یان هاوسەنگی هەڵچونی، هەروەها ڕوپێوی بەو توێژینەوانەش دەوترێت کە نمونەیەك لە هەمو چین و توێژەکانی کۆمەڵ وەردەگرن. بێ ئەوەی یەکە یەکەی تاکەکان وەربگرن.

٢. پێشبینی: واتە توانای پێشبینی کردنی ئاڕاستەی ڕەفتارەکە (ڕەفتاری تاکەکەس بێت یان کۆمەڵگا) لەسەر بنەمای ئەو زانیاریەی کە لەسەر ئەو ڕەفتارە دەست دەکەوێت. لەو پرنسیپەوە کە ڕەفتاری مرۆڤ تا ڕادەیەك جێگیرەو تا ڕادەیەکیش نەرمێتی تیدایە. هەمو ئەمانە یارمەتی دیاریکردنی ئاستی چاوەڕوانکراوی ڕەفتارەکە دەکات.

٣. **دەستنیشانکردن:** پێوەر یان تێستە جیاوازەکان بەکاردەهێنرێت بۆ ناسینی ئاستی کەموکوریتیەکان. ناسینی لایەنی بەهێزیو لاوازی تواناکانی تاك. لەکاتی جێبەجێکردنی تێستەکاندا گرنگی دەدەرێت بە ناسینی ئەو لایەنانەی کە تاکەکەس پێوەی دەناڵێنێت، یان لەوانە لە ئاییندەدا پێوەی بناڵێنێت. تا چەند ئامرازی دەستنیشانکردنەکە زانستیو ڕاست ئەنجامبدرێت ئەوەندە ئەنجامەکان ڕاست دەردەچن.

٤. **چارەسەری:** کاتێك لایەنە بەهێزو لاوازەکانی تاك ناسرا، پاشان ئامادە دەکرێت بۆ چارەسەری لەلایەن کەسی ڕاهێنراوەوە بەڕێگای پرۆگرامی تایبەت وەکو فێرکردنو ڕاهێنان، ئامانجی چارەسەری دەرونی گەڕاننەوەی خۆگونجاندنی(تاکە کەس یان کۆمەڵ)ە لەگەڵ خۆیو لەگەڵ ژینگەکەی (غانم، کتاب الکترونی، لا٢٦-٢٨).

## سیفەتە گشتیەکانی جیاوازی تاکایەتی

زۆربەی سەرچاوەکان کۆمەڵە سیفاتێکیان بۆ جیاوازی تاکایەتی دیاریکردووە لە گرنگترینی ئەو سیفاتانەش ئەمانەی لای خوارەوەیە:

١. **جیاوازی تاکایەتی جیاوازی چەندێتیە نەك چۆنیەتی:** واتە جیاوازی نێوان کەسێك بۆ کەسێکی تر مانای ئەوە نییە، کە ئەو سیفەتە لە کەسێکیاندا هەبێتو لەکەسەکەی تردا بەهیچ شێوەیەك بونی نەبێت. بەو شێوەیە نییە بگرە ئەمە بە مانای ئەوە دێت، کە ئەو سیفەتە لە هەردوکیاندا هەیە، بەڵام ڕێژەکەی جیاوازە لە یەکێکیاندا لەوانەیە زۆر بێتو لەوەی تریاندا لەوانەیە کەم بێت یان مام ناوەندی بێت. ناکرێت کەسەکان بەم جۆرە دابەش بکرێن بۆ نمونە (ئەوەی زیرەکی هەیە، ئەوەی زیرەکی نییە)، جیاوازی نێوان کەسی بلیمەتو کەسی

کەمتونای هزری تەنها لە بڕی زیرەکیدایە نەك ئەوە بێت، کە کەسێك زیرەکی هەیە ئەوەی تر نییەتی. یان ئەوەی بالآی بەرزە وئەوەی بالآی نزمە، سەرنجبدەن، کە ناتوانین بڵێن کەسەکە بالآی نییە هەمو کەسێك بالآی هەیەو دەیپێوین بە مەتر، بەڵام هەیە بەرزترە و هەیە کورترە.

ئەم بۆچونە بۆچونێکی نوێیە بۆ جیاوازی تاکایەتی، لە ئەنجامی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە کرداریەکان دەرکەوتووە، کە تاکەکان لە سیفەتێکی دیاریکراودا دابەشدەبن بەسەر خەتێکی ڕێکدا کە سیفەتەکە دەنوێنێت، لەسەرێکیەوە زیاترین ڕێژی بونی ئەو سیفەتەیەو لەسەرێکی تریەوە کەمترین ڕێژەی سیفەتەکە دەنوێنێت، ئینجا ئەم دابەشکاریە دەتوانێت پێوانەی جیاوازی تاکایەتی بکات بەپێ وتەیەکی بەناوبانگی (ئیدوارد سۆرندایك) کە وتویەتی" هەمو شتێك کە بە ڕێژەیەك هەبێت، هەبونی ئەو ڕێژەیە بۆخۆی واتای ئەوەیە دەکرێت بپێورێت".

بەڵام بیرمان نەچێت هەمو سیفەتێك، کە جیاوازی لە بڕ ونمرەدا هەبوو کاتێك ئەو جیاوازیە بگاتە ئەوپەڕی جیاوازی لەوانەیە لە جیاوازی چەندێتیەوە بگۆڕێت بۆ جیاوازی چۆنیەتی. هەروەکو زانا برجسون دەڵێت (کاتێك ئاو پلەی گەرمای کوڵانەکەی زیاتر دەبێت دەگۆڕێت بۆ هەڵم". لە لایەکی تریشەوە پێویستە بزانین ڕێژەی هەر سیفەتێك چەند تا ئەوپەڕی کەمبێتەوە هەر نابێت بە سفر و نەبوون.

٢. **جیاوازی تاکایەتی جێگیرە لە تێکراییدا (معدل)**: جیاوازی تاکایەتی بە پێی تێپەڕبونی کات دەگۆڕێت، بەڵام لەهەمو سیفەتە جیاوازەکانی کەسێتیدا ڕێژەی گۆڕانەکەی بەیەك ئاست نییە، لێکۆڵینەوە زانستیەکان سەلماندویانە، کە جێگیری تێکڕای جیاوازی تاکایەتی لە

سیفەتە هزریەکاندا زیاترە وەك لە جێگیریەکەی لە تایبەتمەندییە هەڵچونییەکاندا، بەهۆی ئەوەوەیە کە تایبەتمەندی هەڵچونی زیاتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری هۆکارە ژینگیەکانەوە وەك لە سیفەتە هزریەکان. کەواتە جیاوازی تاکایەتی لە هەموو سیفەتەکاندا وەکو یەك بە جێگیری نامێنێتەوە، بە پێی لێکۆڵینەوەکان جێگیرترین جیاوازی بریتیە لە جیاوازی زانینی وهزریەکان، بەتایبەت لە دوای قۆناغی سەرەتای هەرزەکاریەوە. مەیل یان ئاڕاستە تا ماوەیەکی کاتی درێژ بە جێگیری دەمێنێتەوە. جیاوازی خەسڵەتەکانی کەسێتی زیاترین گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەمەش مانای ئەوەیە کە سیفەتە بۆماوەیەکان جێگیریان زیاترە لە سیفەتە وەرگیراو وژینگەیەکان.

٢. **مەودای جیاوازیە تاکییەکان:** مەودا بەمانای جیاوازی نێوان بەرزترین نمرەو نزمترین نمرەی هەر سیفەتێك لە سیفەتە جیاوازەکان. مەودا لە سیفەتێکەوە بۆ سیفەتێکی تر دەگۆڕێت، هەروەها لە جۆرێکەوە بۆ جۆرێکی تری سیفەتە سەرەکیەکان دەگۆڕێت. ئەنجامی توێژینەوەکان ئەوەیان سەلماندوە کە فراوانترین مەودای جیاوازی تاکایەتی لە تایبەتمەندی کەسێتیدا دەردەکەوێت، کەمترین مەوداشی لە جیاوازی نێوان ڕەگەزەکاندا دەردەکەوێت، بەڵام جیاوازی لایەنی هزریەکان مام ناوەندییەو دەکەوێتە نێوان ئەم دو مەوادایەوە. مەودای جیاوازی تاکایەتی لای ڕەگەزی نێر زیاترە وەك لە لای ڕەگەزی مێ (سلمان، ص٣٥).

بۆ نمونە ئەگەر لە پۆلێك لە پۆلەکاندا باڵای خوێندکارەکانمان پێوا ئەوا باڵابەرزترین خوێندکار(١٨٠)سم بوو، کورترین خوێندکاریش (١٤٠)سم بوو.ئەو کاتە مەودای نێوان ئەو دو باڵایە (٤٠) ئەوەش مەودایەکی زۆرە،

ئەمە لای کوڕان وەهایە، بەڵام لای کچان بەو جۆرە مەودای جیاوازیان زۆر فراوان نییە واتە باڵایان نزیکە لەیەکترەوە.

زانا(وکسلەر) هەستاوە بە پێوانەکاری زۆربەی توانا و لێهاتوییە هزریەکان، کە بە ئامرازو پێوانە سایکۆلۆژیەکان پێوانەی کردووە. بۆی دەرکەوتوە کە ڕێژەی بەتواناترین کەس تا لاوازترین کەس لەم توانا و لێهاتوییە عەقڵیانەدا بەڕێژەی (٢:١) ئەوەش بە مانای ئەوە دێت کە ووزەی بەتواناترین کەس یەکسانە بە نیوەی ووزەی کەمتواناترین کەس(الخالدی، ٢٠٠٣،لا٢٢٢).

جیاوازی بەزرترین نمرەو بچوکترین نمرە بەهەندێك هۆکارەوە بەندە.




٤. **جیاوازی تاکایەتی ڕێکخستنێکی هەرەمی هەیە:** ئەنجامی زۆرێك لە لێکۆڵینەوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە لە ئەنجامی پێوانەکردنی سیفەتە تایبەتو جیاوازەکانی کەسێتی دەرکەوتووە کە جیاوازی تاکایەتی ڕێکخستنێکی هەرەمی هەیە. گرنگترین سیفەت لوتکەی هەرەمەکەی گرتووە، لەدوای ئەوەوە ئەو سیفەتانە دێن کە کەمتر گشتین، ئیتر لێژبونەوەی سیفەتەکان زیاتر دەبێت تا دەگاتە ئەو سیفەتەی بنکەی هەرەمەکە دەگرێتەوە و لەڕوی گشتگیریەوە دەرکەوتنی لە هەڵوێستێك تێپەر ناکات. لە سیفەتە زانینیو هزریەکاندا زیرەکی لوتکەی هەرەمەکە دەگرێت واتە گرنگترینیانە،

دوای ئەویش ئەو سیفەتانە دێن، کە توانای دەستکەوتی خوێندنی و پیشەیی‌و بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت تا دەگاتە توانا سەرەتاییەکان، هەمان شت ڕودەدات بۆ سیفەتە مەزاجی‌و جەستەییەکان (سلّمان، ٢٠٠٦، ص٣٦).




٥. **جیاوازی تاکایەتی شیاوی گۆڕانکارییە:** ئەمەش مانای ئەوەیە، کە جیاوازی تاکایەتی بەهۆی فێرکردن‌و ڕاهێنان‌و گۆڕینی ژینگەی چواردەورەوە دەتوانین بیگۆڕین یان کەمی بکەینەوە. ئەگەر جیاوازی کەسی(ا) لەگەڵ کەسی (ب) لە سیفەتێك لە سیفەتەکاندا (٣٠) پلە بوو. ئەم جیاوازیە کەمدەکات ئەگەر کەسەکە توانی لێهاتویی کەسیەکانی‌و توانا شارەوەکانی بەکاربهێنێت لە ڕێگەی بەکارهێنانی شێوازی زانستی پەروەدەیی فێربونی شارەزایی گونجاوەوە (القضاء،الترتوري،٢٠٠٦،ل٢٥٥).

بۆ نمونە لەسەرەتای دەستپێکردنی ساڵی خوێندنەوە مامۆستای وەرزش تاقیکردنەوەی توانای وەرزشی بۆ خوێندکارەکان ئەنجامدا. یەکێکیان لە هەمویان بەتواناتر دەردەچێت، بەڵام یەکێك لە خوێندکارەکان لەڕێگەی ڕاهێنانەو شارەزاییەوە لەوانەیە ببێتە ڕکابەری ئەو خوێندکارەی تر کە سەرەتا یەکەم بووە.

٦. **جیاوازی تاکایەتی لە تواناکانی تاکەکەس وتایبەتمەندی کەسێتیدا:** ئەوەی دەبینرێت ئەوەیە کە تایبەتمەندی جەستەیی‌و هەڵچونی‌و زانینی تاکەکەس بە پێی قۆناغەکانی تەمەنی دەگۆڕێت، ئەوەش بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەوە کە لە گەشەی کەسەکەدا ڕودەدات لەگەڵ بارودۆخی ژینگەی کۆمەڵایەتی کە کەسەکەی پیا تێپەر دەبێت، لە لایەکی تریشەوە بەو ئەزمون‌و شارەزاییەی کە لە ڕێگەی فێربون‌و کارو پیشەوە بۆی دروستدەبێت، هەمو ئەمانە کاریگەریان لەسەر تواناو تایبەتمەندییە جیاوازەکانی کەسەکان هەیە لە ڕوی بەهێزبونی یان لاواز بونیەوە (القضاء،الترتوري،٢٠٠٦، لا٢٥٥).

کەواتە مرۆڤ خۆی دەتوانێت پەرە بە تواناکانی بدات، جا ئەوە لە ڕێگەی گەشەی سروشتیەوە بێت یان لە ڕێگەی ڕاهێنان وفێربوونەوە بێت، وەکو دەزانین هێزی ماسولکەکان لە ڕێگەی ڕاهێنانەوە زیاتر دەبێت، هەروەها بە پێی گەشەو گەورە بوونیش هەر بەهێز دەبێت. بەڵام کە گەیشتە قۆناغێکی دیاریکراو ئیتر وردە وورده هێزەکەی کەم دەبێتەوە.

## هۆکارەکانی دروستبونی جیاوازی تاکایەتی

هەمیشە پرسیارە سەرەکیەکە ئەوە بووە بۆچی کەسەکان لەیەکتر جیاوازن؟ هۆکاری ئەم جیاوازیە چییە؟ جیاوازیەکان زۆرن یان کەمن؟ ئەمانە هەموی پرسیاری گرنگن کە هەمو لایەنەکانی ڕەفتاری مرۆڤ دەگرێتەوە، پرسیار لەسەر هۆکاری جیاوازی کەسەکان لەیەکتر زۆر گێرمەوکێشەی بەدوای خۆیدا هێناوەو دیالۆگەکان زۆر فراوان بو لەسەری تا گەیشتون بەو ئەنجامەی کە هۆکارەکان زۆر زۆرن، بەڵام دەکرێت لەم هۆکارانەدا دیاریبکرێن(الأمارة، ٢٠١٤، لا٣٩٧).

**یەکەم. هۆکارە بۆماوەییەکان:** ئەوەش ئەو هۆکارانەیە کە منداڵ لەڕێگەی بۆماوەوە لە باوانیەوە بۆی دەمێنێتەوە، یان لە ڕێگەی ئاسەوارە خراپەکانی قۆناغی دوگیانی دایکەکەو تێپەڕبونی بە باری تەندروسیتی جەستەیی یان دەرونی خراپدا، لە ئەنجامدا کاریگەری خراپ دەکاتە سەر پێکهاتەی جەستیی یان عەقڵی کۆرپەلەکە ئیتر یان لە ڕوی جەستەییەوە لاواز دەبێت یان لەڕوی هزری و عەقڵیەوە کەمتوانا دەبێت یان شێواندی زگماکی(التشوه الخلقی) بۆ دروستدەبێت(حسن،لا١٣٦) ئەو جیاوازیانەی بەهۆی بۆماوەوە دروست دەبن تا ڕادەیەك جێگیرە لە کەسەکەدا گۆڕین‌و کەمکردنەوەی سەختە. بۆ نمونە ئەو منداڵەی بە لاوازی بینینەوە لەدایك دەبێت زەحمەت توانای بینینی بۆ بگەڕێنرێتەوە.

**دووەم. هۆکارە ژینگەییەکان:** ئەمەش لە ئەنجامی شێوازی جیاوازی ڕەفتاری خێزان‌و کۆمەڵ‌و کەلتورەوەیە، لەوانەیە ئەم فاکتەرانە بە جیا یان بەیەکەوە کاریگەری گەورە لەسەر بونیادی هزری‌و مەزاجی کەسەکە بکەن،

لەوانەیە شێوەیەکی نەرێنی پەروەردە وای لێبکات وەڵامی شێوازەکانی فێربون نەداتەوەو بەمەش دەستکەوتی خوێندنی نزم بێت.

سەرنج بدەین لە قوتابخانەیەکدا ئەو منداڵانەی لە لادێوە هاتون جیاوازن لە رەفتارو مامەڵەیان لە منداڵانی شار نشین کە جوڵەجوڵکەرو هارن، بەڵام منداڵی لادێ نارامترن. لەڕوی کاری کرداریو ژیانیەوە منداڵی لادێ باشترن، لەڕوی زانیاریو داتاوە منداڵانی شار باشترن.

**سێهەم. فاکتەری هاوبەشەکان:** ئەمە لە ئەنجامی هەردو هۆکارەکانی بۆماوەو ژینگەیی بەیەکەوە، ئەم هۆکارە لە هەردو هۆکارەکەی تر زیاتر کاریگەری نەرێنی دروست دەکات لەسەر رەفتار، چونکە بەیەکەوە کاریگەری لەسەر تاکەکەس دروستدەکاتو وەڵامدانەوەی لاواز دەکات دەبێتە کەسێکی نەرێنیو لاواز لە کۆنترۆڵ کردنی رێڕەوی ژیانی.

**چوارەم: فاکتەری پەروەردەیی:** ئەم هۆکارە لەوانەیە لە ڕێگەی شێوازی وانە ووتنەوە، یا هۆکارە فێرکاریەکانەوە یان بەهۆی خراپ مامەڵەکردنی ژینگەی قوتابخانەوە بێت جا لە لایەن مامۆستا یان بەڕێوبەر یان هاوپۆلەکانیەوە بێت. یان بەهۆی باش تێنەگەیشتن بێت لە بنەمای وانەیەك لە وانەکان (هنیة،١٩٩٩، ص ٣٦).

بۆ نمونە ئەگەر سەرنجبدەین خوێندکارێك سستە لە یەکێك لە وانەکاندا ئەمە لەوانەیە بەهۆی بێتوانایی هزریەوە نەبێت لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە هۆکارەکانی پەیوەست بە وانە وتنەوەو یان مامەڵەی نەرێنیەوە وەکو باسمان کرد.




## پێوانەکردنی جیاوازی تاکایەتی

ناسینی جیاوازی تاکایەتی زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بتوانین مەوداکەی کەم بکەینەوە یان ڕەچاوی بکەین، زۆر پێوەری دەروونی جۆراو جۆر بۆ ئەو مەبەستە داڕێژراون تا جیاوازی تاکایەتی لە نێوان تاکەکاندا بپێوین، بۆ نمونە ڕێژەی زیرەکی منداڵێك بپێوینو بەراوردی بکەین بە ناوەندی زیرەکی منداڵانی هاوتەمەنی خۆی، نمونەی ئەو تێستو پێوانەکارانەش ئەمانەی لای خوارەوەیە:

١.تێستی زیرەکی.

٢. تێستی تواناو ئامادەباشیە جەستەییو عەقلی وهەستیو لێهاتوییو جوڵەییەکان.

٣. تێستی کەسێتی لەو چوارچێوەیەشدا تێستی مەیلو ئاراستەدەروونیەکانو بەهاو تایبەتمەندییە خۆڕسکەکان. و مەزاجی تاکەکانو دیدگای تاك بۆ خودی خۆیو ئاستی تموحەکانیو هێزی پاڵنەرەکانی، ئاستی دڵەڕاوکێو توندوتیژی، سەرباری ئەو تێستانەی کە دەستنیشانی کەسی ئاساییو کەسی نائاسایی دەکات (الشازلي،٢٠٠١،لا٢٠١)

بۆ نمونە مامۆستایەکی وەرزش کاتێك بیەوێت پرۆگرامێك لەسەر خوێندکارەکانی جێبەجێ بکات ئەوا پێویستە سەرەتا تێستێکی تواناو مەیلو لێهاتویی خوێندکارەکانی بکات تا بتوانێت پرۆگرامەکەی بەشێوەیەك دابڕێژێت لەگەڵ جیاوازی تاکایەتی خوێندکارەکانیدا بگونجێت.

## دابەشبونی جیاوازی تاکایەتی

ئەگەر جیاوازی تاکەکان لە تایبەتمەندیی دەرونیاندا بەزۆری لە روی چەندێتیەوە بێت، ئایا جیاوازی نمرە یان ڕێژەکەی چۆن لە نێوان کەسەکاندا دابەش دەبن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە تەنها لە ڕێگەی خشتەی دوبارە بونەوەو وێنەی بەیانیەوە دەکرێت وەڵام بدرێتەوە کە ئەو دابەشبونە ڕون دەکاتەوە.

وەکو زۆرێك لە ئامرازە ئاماریەکانی تر دابەشبونی دوبارەیی هۆکارێکە بۆ دیاریکردنی چەندێتیو ڕێکخستنی داتاکان بەجۆرێك وای لێ بێت تێبگەین لێیو شیبکەینەوە واتای پێ بدەین، لەم بارەدا نمرەی تێستەکە کۆدەکەینەوە لە چەند دەستەیەکدا، پاشان بۆ هەر دەستەیەك ئەو ژمارانەی کە تیایدا دوبارەبۆتەوە دایدەنێین.

لەوانەیە ئەم دابەشبونو دوبارەبونەوەیە بکرێتە وێنەیەکی داتایی، ئەمە لە زانستی ئاماردا زۆر بڵاوە کە پێی دەوترێت چەماوەی دابەش بونی دوبارەیی، پاشان دەتوانین وەسفی تاکەکان لە ڕێگەی یەکێك لە پێوەرەکانی سەنتەری دابەشکردنەوە (central tendency) (ناوەند، منوال، ناوەڕاست) بکەین. ئەوەی لەم جۆرە دابەشکاریەدا سەرنجدەدرێت ئەوەیە کە زۆربەی بارەکان دەکەونە ناوەڕاستی مەوداکەوە، تا چەند بەرەو ئەم لاو ئەولای چەماوەکە برۆین ژمارەی حاڵەتەکان بە شێوەیەکی ڕێکوپێكو بەردەوام کەم دەبنەوە، لەم چەماوە سروشتیەدا هیچ بۆشاییەك نابینرێت تا

دەستەیەك یان چەند دەستەیەك لەیەك جیانەبنەوە. ئەم چەماوەیە دولاکەی وەکو یەك دەبێت ئەگەر لەناوەڕاستەوە بە هێڵێکی ڕاست دابەشمانکرد، لەم کاتەدا ناو دەنرێت چەوماوەی دوو لایەکسان، یان نۆرمەڵ کێرڤ. دو زانای بیرکاری کە ناویان(لابلاس و گاوس) بوو ئەم چەماوەیەیان داهێنا لە کاتی لێکۆڵینەوەیان لەسەر ڕێکەوتو هەڵەی سەرنجدان دەکرد.




دەتوانین ئەوە بڵێن کە جیاوازی تاکایەتی پشت بە ژمارەیەکی زۆر فاکتەری سەربەخۆ دەبەستێت کە ناتوانین بەشیوەیەکی خۆ ویستو ئیرادی کۆنترۆڵی بکەین بەو شێوەیە بە پێی یاسای ڕێکەوت دابەش دەبێت. مەودای چەماوەی دو لایەکسانی ئەزمونی لە پێوانەی تایبەتمەندییە دەروونییەکاندا لە نێوان (م – ٣ع)و (م + ٣ع) م ناوەندی ژمێرەییەو ع لادانی پێوەریە، بەڵام مەودای چەماوەی یەکسان(ئیعتدالی) تیۆری لە نێوان (م -٥ع) و (م +٥ع) ئەمە لەبەر گرتنەوەی هەمو ئەو حاڵەتو ئەگەرانەیە کە لەکاتی توێژینەوە لەسەر نمونەی ئەزمونیدا دەرناکەون (الزعبی، ٢٠١٤، ص ٣٥).

لە دەرئەنجامی تایبەتمەندیەکانی ئەم چەماوە سروشتیە، دەبینین کە بە نزیکی(٦٨٪) تاکەکان ئاستی مامناوەند وەردەگرن لەو خەسڵەتەی کە پێوراوە، واتە لە مەودای(م+١ع) تا (م - ١ع)، بەڵام ژمارەی ئەو کەسانەی کە دەکەونە نێوان (م+١ع) و(م+٢ع) و هەروەها لە نێوان (م-١ع) و(م-٢ع) دەکاتە نزیکەی (١٤٪)، بەڵام حاڵەتە زۆر پەڕگیرەکان (متطرف) لە هەردو ناڕاستەکەدا واتە زیاتر لە(م+٢ع) یان کەمتر لە(م-٢ع) بەنزیکی یەکسانە بە(٢٪)لە کۆی گشتی هەمو حاڵەکان. لە هەژمارکردنمان بۆ ئەمانە پشت دەبەستین بە قەبارەی چەماوە سروشتیەکە (الشیخ، ٢٠١٤، لا ٢٨).

لەوانەیە چەماوەی دابەشبونی نۆرمەڵ شێوەکەی بگۆڕێت شێویەکی دەرپەریوی بۆلای چەپ یان بۆلای ڕاست یان لاکێشەیی‌و یان زیاتر لە لوتکەیەکی بۆ دروست ببێت. لە گرنگترین ئەو فاکتەرانەی کە کاریگەری دەکەنە سەر چەماوەی دابەشبونی سروشتی ئەمانەی لای خوارەوەیە:

- سروشتی ئەو سیفەتەی کە دەپێورێت:

دابەشبونی سروشتی لە ئەنجامی کۆمەڵە هۆکارێکی سەربەرخۆیە کە مرۆڤ ناتوانێت بە ویستی خۆی کۆنترۆڵی بکات. هەر ئەمەش دەبێتە هۆکار بۆ دابەشبونی هاوسەنگ.

لە کەوتنە خوارەوەی پارەیەکی مەعدەنی بە دیوی (وێنە یان نوسینەکەیدا) زۆر هۆکار هەیە کە کاریگەری دەکاتە سەری وەکو بەرزی فرێدانی پارەکە، چۆنیەتی گرتنی پارەکەو خوارکردنەوەی دەست...هتد. ئەگەر کەسەکە توانی کۆنترۆڵی ئەو هۆکارنە بکات لەوانەیە بتوانێت کۆنترۆڵی ناڕاستەی ڕوی پارەکە بکات پێش هەڵدانی. ئەگەر ئەمە بۆ چەند جارێك دوبارە بکاتەوە، ئەو چەماوەیە کە دروست دەبێت دابەشکردنێکی سروشتی‌و نۆرمەڵی نابێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی کۆنترۆڵی پارەکە دەکات

یاسایەکە کە پشت بە پرنسیپی ڕێکەوت دەبەستێت. بە تایبەت ئەگەر پارەکەمان بۆ سەد جار هەڵدا، مەبەستمان لە ڕێکەوت ئەوە نییە کە ئەمە لە سیستمی سروشتی یاسای هۆو ئەنجام دەربچێت. مەبەست ئەوەیە کە دیاردەکان پەیوەستن بە ژمارەیەکی زۆری فاکتەری سەربەخۆو ئاڵۆزەوە کە تا ئێستا کاریگەریان بەتەواوی نەناسراوە (ابوحطب، ١٩٨٠).

○ **سروشتی نمونەی توێژینەوەکە:**

جیاوازی لە دابەشبونی دوبارەی جیاوازدا دروست دەبێت بەهۆی ئەوەی کە نمونەکە بە هەر هۆکارێك بێت بەشێویەکی هەڵبژاردنو بەمەست دەست نیشان دەکرێت. لەبەر ئەوە کاتێك دابەش بونەکە لە نۆرمەڵو سروشتی بون دور دەکەوێتەوە گومان سەبارەت بە گونجاوی ئەو نمونەیەی کە لێکۆڵینەوەکەی لەسەر کراوە دروست دەبێت. بۆیە لە لێکۆڵینەوەی جیاوازی تاکایەتیدا باشترە کە ژمارەی زیاتری نمونە وەربگیرێت.

○ **سروشتی ئامرازی پێوانەکاریەکە:**

ئەو پێوەرەی بەکار دەهێنرێت کاریگەری دەکاتە سەر دابەشبونی سروشتی جیاوازی تاکایەتی نمونەکە، لەوانەیە شێوەیەکی لا دەرپەڕیومان دەست بکەوێت ئەگەر مەودای پێوەرەکە تەرکیزی خستبێتە سەر ئاستە زۆر بەرزەکان یان ئاستە زۆر نزمەکان. یان ئەگەر ئامرازەکە واتە پێوەرەکە لەسەر نمونەیەك جێبەجێبکرێت کە گونجاو نەبێت بۆی. وەك باوە کاتێك توێژەرەکان چەماوەی سروشتیان بۆ دەرناچێت لە پێوانەکردنی نمونەیەکی توێژینەوەکە، ئەو کاتە یان برگە لادەبەن یان زیاتری دەکەن یان چاکسازی لە برگەکاندا دەکەن. یان گۆڕانکاری لە جێگرەوەی پێوەرەکەدا دەکەن (الزعبی، ٢٠١٤، لا ٣٦).

چەماوەی سروشتی چەماوەیەکی ئەزمونی نییە ئێمە لەئەزمونە دەرونییەکانەوە بەدەستمان هێنابێت، واتە ئێمە لە پێوانەکردنی دیاردە دەرونییەکانەوە وەرمان نەگرتوە، بەڵکو ئێمە بەکاری دەهێنین بۆ ئامادەکردنی پێورە دەرونییەکان، کاتێك پێوەرێك ئامادە دەکەین لەسەر ژمارەیەکی زۆر لە کەسەکان جێ بەجێی دەکەین وا پێشبینی دەکەین کە دابەشبونێکی سروشتی دیاردەکەمان دەست بکەوێت. ئەگەر دەستمان نەکەوێت ئەوا دەبێت چاکسازی لەو پێوانەیەدا بکەین. وەکو ئەوەی ژمارە بڕگەکانی زیاتر بکەین یان بڕگەکان چاك بکەین یان هەندێکی لابەرین. دابەشبونی سروشتی وەکو پێوەرێکە بۆ بڕیاردان بەسەر ئەو پێوەرانەدا کە ئامادەیان دەکەین بۆ توێژینەوەکان.

## بەشی سێهەم

---

جیاوازی لە ناو خودی یەك کەسدا

جیاوازی سیفاتەکان لەناو خودی یەك کەسدا

ئاستی گۆڕانکاری لە سیفاتی یەك کەسدا

جیاوازی گەشەی عەقڵی لە خودی یەك کەسدا

پێوانەکردنی جیاوازی تاکایەتی لە خودی یەك کەسدا.

تایبەتمەندی جیاوازی تاکە کەس لەناو خودی خۆیدا.

---

## جیاوازی لە ناو خودی یەك كەسدا

گرنگی لێكۆڵینەوەی جیاوازیەكان بۆ تاكەكەس

لێكۆڵینەوەو توێژینەوەی گۆڕانكاری خەسڵەتەكانی تاكەكەس گرنگی تیۆری‌و كرداری خۆی هەیە، كاتێك تێستی زیرەكی بۆ منداڵ ئەنجام دەدەین‌و ئەنجامەكەی بە تەنها یەك ژمارە یان یەك ئاست دەدەینەوە بە دایك‌و باوكی پێی دەڵێین ئاستی زیرەكی منداڵەكەتان كەمترە لە مام ناوەند. ئەمە مانای چییە؟ خۆ ئێمە زۆر شت لەسەر لایەنی هزری ئەو منداڵە ناناسین، ئایا ئەم منداڵە لە هەموو لایەنەكانەوە ئاستەكەی كەمترە لە مام ناوەند؟ یان جیاوازی هەیە لە گەشەی عەقڵیدا ؟ ئایا ئاساییە یان سەركەوتووە لە هەندێك ڕوی تایبەتەوە؟ تێستەكانی زیرەكی تەنیا یەك ژمارەمان دەداتێ‌و ئاستی گشتی عەقڵی منداڵەكەمان لە ژمارەیەكدا بۆ كورت دەكاتەوە، بەمەش زۆر ڕاستی دەشارێتەوەو پەردەپۆشی دەكات. لەوانەیە دو كەس هەمان ئەنجام وەربگرن لە



تێستی زیرەكیدا، بەڵام وێنەی عەقڵی هەردوكیان لەیەكتر جیاواز بێت. ئەگەر

هەمو تواناکانی تاك لەیەك ئاستدا بێت. ئەوا وەسفکردنی بەیەك ژمارە کە ئەنجامی تێستی زیرەکیە شتێکی ڕاست دەردەچێت. بەڵام لێکۆڵینەوە زانستیەکان دەریان خستووە، کە جیاوازی ئاشکرا هەیە لە ئاستی ئەو سیفەتانەی کەسێك هەیەتی. لێرەوە ئەوە بە پێویست دەبینرێتەوە کە لێکۆڵینەوە بکرێت لەسەر ئاستە جیاوازەکانی سیفاتی تاکەکەس. ئەم جۆراو جۆری سیفاتانە لای کەسی ئاسایی‌و لای کەسانی کەمتوانای هزری‌و لای ئەو کەسانەی کە لە ئاستێکی بەرزی زیرەکیدان واتە بلیمەتن، هەیەو دەبینرێت.

هەر بۆیە کەسێك کە بۆ ئیشێك دەشێت مەرج نییە بۆ ئیشێکی تر شیاو بێت. بە هەمان شێوە ئەوەی لە خوێندنی زانست‌و پسپۆریەکدا شکست دەهێنێت مەرج نییە لە خوێندنی پسپۆریەکانی تریشدا هەر سەرنەکەوێت. ئەو منداڵەی کە لە تێستی زیرەکیدا ئاستی نزم بەدەست دەهێنێت ئەوا لە پرۆگرامی خوێندنی ئاساییدا سەرکەوتوو نابێت. بەڵام لەوانەیە لە بوارە هونەری، میکانیکی، کۆمەڵایەتی، میوزیکدا لێهاتوو بێت. ئەم ڕاستیە دەبێت لەبەرچاوان بێت کاتێك ڕێنمایی پیشەیی‌و خوێندنی پێشکەش بە خوێندکاران دەکرێت. یان لەکاتی دابەشکردنی خوێندکاران بەسەر پۆلەکاندا، یان دابەشکردنیان بەسەر کۆلێجی زانکۆکاندا، ئەمە جگە لەوەی کە پێویستە بونی جیاوازی لە سیفات‌و لێهاتویەکاندا زۆر لەبەرچاو بگیرێت، بۆ کاتی دامەزراندن‌و پلە بەرزکردنەوەی فەرمانبەران‌و کرێکاران (لە کوردستاندا زۆرجار سوپاسنامە بۆ فەرمانبەران‌و مامۆستایان بەگشتی دەردەچێت بەم جۆرەش ئەو خۆشیەی نییە کە سوپاسنامەکە بۆ تاکە تاکەی مامۆستاکان بێت‌و جیاکاری کردبێت کە کێ باشتر وانەی وتۆتەوەو کێ کەم و کورتی هەبووە).

## جیاوازی سیفەتەکان لەناو خودی یەك کەسدا

هەردو زانا (هنری و بینیە) هەر لە ساڵی(١٨٩٦)وە ئەوەیان خستۆتە ڕوو، کە هەمو تواناکان لای یەك منداڵ بەیەك ئاست بونیان نییە لە یەکتر جیاوازن. ئەگەری ئەوەیان دانا هەتا لەیەك بواری سنورداریشدا لەوانەیە توانای جیاواز جیاواز بونیان هەبێت. بۆ نمونە(یادەوەری) دەبینین، کە یادەوەری بینینی، بیستنی، ژمارەیی، مۆسیقی،و ڕەنگ بونیان هەیە، بەڵام هەمویان وەك یەك بەهێز نین لای یەك کەس. یاخود لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تریش بەهێزو لاوازیان دەگۆڕێت.

لەم سۆنگەیەوە دەرونناسان جەختیان لەوە کردەوە، کە دیاردەی جیاوازی لە خودی یەك کەسدا بونی هەیە، لەمەوداو ئاستی جیاوازدا کە لە کەمتوانای عەقڵیەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە بلیمەتەکان. زانا گلفۆرد، (١٩٦٧) ئەوە دەخاتە ڕوو ئەو توێژینەوانەی کە لەسەر کەسانی کەمتوانای عەقڵی ئەنجامیان داوە چەندین شێوازی خۆگونجاندنی کۆمەڵایەتی باشیان نیشانداوە.

هەروەها مایرزو هاوەڵانی(١٩٦٧) دەڵێن ئەو توێژینەوانەی لەسەر منداڵانی کەمتوانای عەقڵی لە تەمەنی عەقڵی جیاوازدا ئەنجامدراوە وەکو(٢،٤،٦ ساڵان). سەرنجدراوە کە ئاستی جیاوازی توانا عەقڵیەکانی تیادا خراوتە ڕوو، کە هاوشێوەی منداڵی ئاسایی هاوتەمەنیان (ابو حطب، ١٩٨٠). وێرای ئەمانە جیاوازی توانا عەقڵیەکان لەیەکتر لای خودی منداڵێکی کەمتوانای عەقڵیش دەبینیرێتەوە. سەرباری ئەوەی کە ئەم حاڵەتە لای ئەو کەسانەش هەیە کە ئاستێکی بەرزی توانای عەقڵیان هەیە واتە لای ئەمانیش توانا عەقڵیەکانیان هاوشێوەو لە یەك ئاستدا نییەو جیاوازە. بۆ نمونە

حاڵەتی پزیشکە پۆڵەندیەکە(فنکلشتین) کە توانایەکی لە ڕادەبەر بلیمەتی نیشانداوە لە بیرهاتنەوەی ژمارەو هەژمارکردنیشی. دەیتوانی لیستێك ژمارە کە لە (٣٥) ژمارە پێکهاتبێت لە یەك خولەکدا بیری بێتەوە ودوبارەی بکاتەوە. وێڕای ئەم بلیمەتیەی لەڕوی توانای یادهێنانەوەی شێوە بینراوەکانەوە مامناوەندی بووە.

هەردو توێژەر (ئاناستازی و لیفی، ١٩٥٤) باسیان لە حاڵەتی گەنجێك کردوە کە ئاستی زیرەکیەکەی لە سەر هەردو پێوانەکاری ستانفۆرد بینیە و ویسکلر بلفیو (٧٠) بووە، لەگەڵ ئەوەشدا بووە بەکەسێکی بلیمەت لە ژەنینی پیانۆ ودانانی ئاوازدا، هەروەها کۆمەڵە توانایەکی تری جیاوازی هەبووە بۆ خوێندنەوەی نۆتەی مۆسیقیو بەیاد هێنانەوەی دو لاپەڕەو نیو پەخشان دوای یەك خولەك لە خوێندنەوەی، بەڵام نەیدەتوانی بیرۆکەی پەخشانەکە تێبگات. هەروەها دەیتوانی ئەو لیتسی ژمارەیەی کە بۆیان دەخوێندنەوەو بەیادی بهێنێتەوە، یان توانای بەیادهێنانەوەی بەروارەکانی هەبوە، بەڵام لە یادەوەری بینینیو تاقیکردنەوەی هەڵهێنجاندا لاواز بوو. لە تێستی ڕێکخستنی وێنەی ویکسلر سفری بەدەست هێنا، ئاستی زیرەکی زارەکی ئەم گەنجە لە تێستی ویکسلەردا(٩٢) بوو، بەڵام ئاستی زیرەکی کرداری(٥٢) بووە(ابو حطب، ١٩٨٠).

هەروەها دەتوانین جیاوازی لە گەشەی خەسڵەتەکانی یەك کەسدا بدۆزینەوە جا ئەوە کەسێکی ئاسایی بێت یان بلیمەت، ئەویش بە پشتبەستن بە ئەنجامەکانی تێستی زیرەکی. بە لێکۆڵینەوە لە حاڵەتی تەنیا کەیسێك دەرکەوتوە، کە ئەو خەسڵەتە لە کەمتوانای عەقڵیەکاندا هەیە لە لای بلیمەتەکانیش هەیە. بۆ نمونە بەهرەی مۆسیقی، یان وێنەکێشان، یان توانای ئەنجامدانی کارە میکانیکیەکان، کە لای کەسانی ئاسایی هەیە، دەبینین لای

کەسانێك کە ئاستی بەرزی زیرەکیان تۆمار کردوە،بەڵام توانا میکانیکیان کەمە، توێژینەوەکان ئەوەیان ئاشکرا کردوە ئەو کەسانەی کە زۆر بە بیلمەت دانراون لە زانستی بیرکاریدا کەچی لە تێستی زیرەکی گشتیدا زۆر لە سەرکەوتوەکان نەبوون. ئەمەش واتای ئەوەیە کە توانای هەژمارکردن توانایەکی سەربەخۆیە لە توانای زیرەکی گشتی. ئەوە تەنها توانای زمانەوانییە کە پەیوەستە بە توانای زیرەکی گشتیەوە. هەروەها توێژمران ئەوەیان دەرخستوە کە ئەوانەی ئاستی توانای عەقڵیان نزمە لە توانای زمانەوانیشدا ئاستێکی نزمیان تۆمار کردووە. ئەمە جگە لەوەی کە توانای سەرکەوتن لە خوێندنو پیشەدا لە ئاستێکی بەرزدا بەم توانایەوە بەستراوەتەوە واتە (توانای زمانەوانی). لە ڕویەکی ترەوە ئەو کەسانەی کە ئاستێکی بەرزی توانای زمانەوانیان هەیە دەتوانن هەندێك کەموکورتی تری پێداپۆشن و پڕبکەنەوە (لەکوردەواریدا دەڵێن ئەوانەی (دەملوسن) واتە ئاستی بەکارهێنانی زمانیان باشە، دەتوانن خۆیان بەرنەپێشەوە لە هەموو شوێنێکداو لە پلەو پۆستی باشدا جێی خۆیان بکەنەوە، ئەوەش سەلمێنەری ئەم ڕاستیەیە).

جۆراو جۆری توواناکان لای کەسەکان ئەو بوارە دابیندەکات کە لە یەکێك لەتواناکاندا سەرکەوتوو بن، بۆیە ناکرێت ئەو بڕیارە بدەین کە کەسێك دەتوانێت لەهەموو بورەکاندا بەگشتی سەرکەوتو بێت، چونکە لە هەندێك لە توانا عەقڵیەکانی تریدا لەوانەیە سەرکەوتو نەبێت یان مامناوەند بێت، کەواتە ناکرێت بڕیار بەشێوەی گشتی بەسەر کەسەکاندا بدرێت بڵێن فلانە کەس کەمتوانای عەقڵیە یان زۆر بیلمەتە لە هەمو تواناکانیدا بگرە ئەوە بابەتێکی ڕێژەییە لای هەمو تاکێك لە مرۆڤەکان.

سەرباری ئەمانە بە تێپەربونی کات گۆڕانکاری لە خەسڵەتی جیاوازیەکانی یەك کەسدا ڕودەدات، هەر ئەو گۆڕانکاریەش وا دەکات تاکەکەس لە قۆناغێکی تەمەنەوە بۆ تەمەنێکی تر جیاواز بێت. ئەگەر لە تەمەنی دە ساڵیدا توانای هزری کەسێکمان پێوا دەبینین جیاوازە لە توانای هزریەکەی کاتێك دەبێتە پانزە ساڵ، ئەم جیاوازیەش جیاوازیە لە نمرەدا، بەڵام (پیاژە) زانای دەروناسی لەسەر ئەم بۆ چونە هاوڕا نییە چونکە پێی وایە گەشەی هزری تەنها لە ڕوی زۆربونی چەندێتیەوە نییە لە تواناکانی تاکدا، بەڵکو گۆڕانکاری چۆنیەتیش دروست دەبێت لە بونیادی هزریو زیاتر ئاڵۆزبونی (الشیخ، ٢٠١٤، لا٢٣).

## ئاستی گۆڕانکاری لە خەسڵەتەکانی[1] یەك کەسدا

زۆر توێژینەوە ئەنجامدراوە بەمەبەستی زانینی ئاستی گۆڕانکاری لە خەسڵەتی کەسەکاندا، خەسڵەت لێرەدا بەو ئامادەباشیە دەرونییە ناوەکیە دەوترێت، کە تا ڕادەیەك بەدرێژایی ژیانی تاکەکەس بە جێگیری دەمێنێتەوە، هەر ئەویش جیاوازی نێوان کەسەکان دیاریدەکات وەکو؛ کەسێتی کراوە، کەسێتی داخراو، کەسێتی دەماری(نیرۆستیك)

لە توێژینەویەکدا کە (کلارك هل، ١٩٢٧) ئەنجامیداوە کە تیایدا ٣٥ تێستی(پێوەر) لەسەر ١٠٧خوێندکاری قۆناغی ئامادەیی جێبەجێکردووە. پاشان داتاکانی شیکردۆتەوە بۆ ئەوەی بزانێت تا چەند جیاوازی لە خەسڵەتەکانی ناو خودی کەسێکدا هەیە. لە ئەنجامدا بۆی دەرکەوت کە ئاستی جیاوازی خەسڵەت لە ناو خودی یەك کەسدا دەگاتە ٨٠٪ی ئاستی جیاوازی پیادەکردنی هەمان خەسڵەت لای کەسە جیاوازەکان.

---

[1] trait

## جیاوازی لە خودی یەك کەسدا لە گەشەی عەقلیدا

گەشەی عەقڵی یەکێکە لە ڕوەکانی گەشەی تاکەکەس، کە بەهۆیەوە جیاوازی نێو خودی کەسەکە هەست پێدەکەین لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەنیدا. ئەو توانا عەقڵیە جیاوازانەی کە زیرەکی دروستیدەکات بەتێکڕای جیاواز گەشە دەکەن. لە توێژینەوەی (برکس)کە ساڵی ١٩٢١ ئەنجامی داوە تیایدا تێستی (ئەلفای شەڕ) ی بەکارهێناوە لە کاتی جەنگی جیهانی یەکەمدا، بۆی دەرکەوت کە جیاوازی گەشەی عەقڵی لە نێوان ئەو کەسانەی کە تەمەنیان گەورەترە، زیاترە لە جیاوازی نێوان گروپی تەمەنە جیاوازەکانی تر.

(جۆنز و کۆنراد) گەیشتن بەو دەرئەنجامەی کە نمرەی تێستی زیرەکی پلە بەپلە زیاتر دەبێت بەپێی هەڵکشانی تەمەن تا تەمەنی١٩-٢١، پاشان وردە وردە کەم دەبێتەوە تا ئەوەندی ناوەندی ژمێرەی نمرەی زیرەکی کەسانی پێگەیشتوی تەمەن(٥٥) ساڵ یەکسان دەبێت لەگەڵ ناوەندی نمرەی منداڵانی تەمەن(١١) ساڵ. فنسنت ئەوەی بەدەست خست کە تێکرای کەمبونەوەی نمرەی زیرەکی بۆ نمونەی تەمەن٢٠ -٦٠ بریتیە لە(٠,٠٣) لادانی پێوەری.

بەڵام سەبارەت بە توانای زمانەوانی (تێستی وشەکان، تێگەیشتنو زانیاری گشتی) لەپێوەری وکسلەردا دەرکەوت کە بە هەڵکشانی تەمەن ئاستەکە باشتر دەبێت تا تەمەنی ٦٠ ساڵی، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە توانای زمانەوانی لە گەورەساڵاندا بەردەوام بەکار دەهێنرێت بە درێژایی ژیانیان.

لە ڕویەکی ترەوە توێژینەوەکانی (بایلیو ئەوانی تر) لەساڵانی شەستەکاندا ئەوەی خستۆتەڕوو، کە توێژەران توانای جیاوازی قۆناغە جیاوازەکانی تەمەن دەپێون. ئەوەی لە دوساڵی یەکەمی تەمەندا دەپێورێت

تەنها بەئاگابونی هەستی جوڵەییە. ئەوەی لە ٢-٤ ساڵیدا دەپێورێت تەنها سوربونو بەردەوامیە. لەدوای چوار ساڵانەوە تێستەکان[٢] گرنگی بە چۆنیەتی مامەڵەکردنی منداڵ لەگەڵ هێماکان دەدەن. لە تێستی(ستانفۆرد بینیە) بۆ گەورەساڵان دەبینین زیاتر پشت بە توانای زارەکیو کاری عەقڵی ئەبستراکت[٣]و هێما دەبەستێت. بەڵام پرسیاری منداڵان زیاتر تەرکیزی لەسەر گەشەی هەستی – جوڵەییە. لەوانەشە یەك کاری کرداری کە لە تەمەنی جیاوازدا ئەنجامی بدات توانای جیاواز بپێوێت. تێستی شێوە ئەندازەییەکان کە لە تەمەنی چوار ساڵاندا بۆ پێوانەکردنی درککردنی شوێنە، بەڵام بۆ کەسێکی شانزەساڵ خێرایی جوڵەی پێدەپێوین. بۆیە چەماوەی گەشە لەچەندین چەماوە پێکهاتووە کە لە چەندین توانای عەقڵی تێکەڵاو دروستبووە (ابو حطب، ١٩٨٠).

## پێوانەکردنی جیاوازیەکانی ناو خودی یەك کەس

پێوانە دەرونییەکانی وەکو پێوانەکاری ستانفۆرد – بینیەو تێستی ویکسلەر – بلفیو بۆ پێوانەکردنی جیاوازی لە خودی یەك کەسدا بەکاردەهێنرێت. تێستی ویکسلەر- بلفیو کە بۆ پێوانەکردنی زیرەکی هەرزەکارو بۆ پێگەیشتوان بەکار دەهێنرێت پێکهاتوە لە یانزە ووردە پێوەر. کاتێك کەسەکە ئەم تێستە وەڵامدەداتەوە لە وەڵامەکانەوە لایەنی بەهێزیو لاوازیمان بۆ دەردەکەوێت. ئایا ئەو لاوازیو بەهێزیە لە لایەنی زیرەکی کرداریدایە یان لە لایەنی زیرەکی تیۆری (زارەکی). بۆ نمونە ئەگەر وەڵامەکانی کەسێك بۆ ئەم تێستە ئەم نمرانەی بەدەست هێنابوو:

---

[2] پێوەر

[3] رووت یان مجرد

زانیاری =١٠، تێگەیشتنی زارەکی= ١٣، دوبارە کردنەوەی ژمارە=٧ ، بیرکاری = ١١، لێکچونەکان = ٦ ، وشەکان=٥، ڕێکخستنی وێنە= ١٢ ، تەواو کردنی وێنە = ١٠، وێنەکێشانی شەشپاڵو = ٣٠ ، کۆکردنەوەی کەلوپەل=٢٠، هێمای ژمارەکان = ٥٦.

بەم نمرانە بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازیەکی زۆر هەیە لەو توانا عەقڵیانەدا لەیەك کەسدا، دەبینین کە لە تێستی وشەکاندا نمرەکەی زۆر کەمە کەچی لە هێمای ژمارەکاندا نمرەکەی بەرزە. بۆ ئەوەی کە بەراوردی خەسڵەتەکانی یەك کەس بکەین دەتوانین سود لە چەماوەی سروشتی وەربگرین. ئەگەر کەسێك لە توانای ژمارەییدا نمرەی (٦٠)ی وەرگرتبوو لە توانای زمانەوانیدا نمرەی (٨٠)ی وەرگرتبوو. بۆ ئەوەی بەراوردی ئەو دونمرەیە بکەی دەبێت بیگەڕێنینەوە بۆ ئەو گروپەی کە کەسی(س) تیایدایە. ئینجا ناوەندی ژمێرەییو لادانی پێوەری بۆ تاکەکانی گروپەکە دەردەکەین. پاشان نمرەی معیاری بۆ هەردو نمرەکەی کەسی (س) دەردەکەین وەکو لە خوارەوە ڕون کراوەتەوە.

| | نمرەی (س) | ناوەندی ژمێرەیی گروپەکە | لادانی پێوەری گروپەکە |
|---|---|---|---|
| تونای ژمێرەیی | ٦٠ | ٥٥ | ٨ |
| توانای زمانەوانی | ٨٠ | ٧٠ | ٧ |

ئەگەر بپرسین لەکام توانادا (س) باشترە دەبێت نمرەی معیاری بۆ دەربهێنین بەم شێوەیەی خوارەوە:

نمرەی معیاری بۆ توانای ژمێرەیی= ______ح______= ___٦٠ – ٥٥___ = ٠،٦٣

ع ٨

نمرەی معیاری بۆ توانای زمانەوانی = ____ح___ = ____٨٠_ ٧٠_ = ١.٤٣

ع ٧

ح= لادانی نمرەیە لە ناوەندەکەی

ع= لادانی پێوەری گروپەکەی

لە ڕێگەی بەراورد کردنی نمرەی معیاری هەر یەکە لە توانای ژمێرەییو توانای زمانەوانی بۆمان دەردەکەوێت کە نمرەی معیاری کەسەکە (س) لە تونای زمانەوانیدا باشترە بەبەراورد بە گروپەکەی.

## تایبەتمەندی جیاوازی تاکەکەس لەناو خودی خۆیدا

بەپێی ئەوەی کە باسمان کرد سەبارەت بە جیاوازی لە نێو خۆی یەك کەسدا تایبەتمەندیەکانی لە خوارەوە کورت دەکەینەوە:



- بەشێوەیەکی گشتی جیاوازی لەخودی تاکەکەسدا شێوەی دابەشبونی سروشتی وەردەگرێت، دەبینین زۆربەی خەسڵەتەکانی تاکەکەس لە ناوەڕاستدا کۆدەبێتەوە، بەشێکی کەمی نمرەکان لادەدەن بۆ لای ڕاست یان چەپی ناوەندەکە.

- مەودای جیاوازی خەسڵەتەکان لە نێو یەك کەسدا دەگۆڕیت، هەرچەندە ئەم مەودای جیاوازییە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تریش هەر دەگۆڕێت.
- هیچ پەیوەندیەکی ئاماژە بۆکراوی ئاماری نییە بۆ پەیوەندی ئاستی توانا عەقڵییەکان بە نمرەی جیاوازی خەسڵەتەکان لەناو خودی یەك کەسدا.
- زۆربەی توێژینەوەکان ئەوە دوپاتدەکەنەوە کە پەیوەندی نێوان توانا عەقڵیەکان نمرەی جیاوازی[4] ناوخودی یەککەس پەیوەندیەکی نەرێنیە. بە واتای جیاوازی ڤاریەنس لای کەمتوانای عەقڵیەکان بەرزترە وەك لەوانەی کە توانای زیرەکی مامناوەندیان هەیە. لای ئەوانەی زیرەکیان مامناوەندە جیاوازی بەرزترە وەك لەوانەی توانای زیرەکی باڵایان هەیە. کاتێك گروپی کەسانی مامناوەندو ئاستی باڵایان بەیەك بەراورد کرد، جیاوازیەکەیان ماناداری ئاماری دەرنەچوو.
- جیاوازی نێوان خود، تاك خۆی وردە وردە کەم دەکات بەهۆی ڕاهێنان لەگەڵ گەورەبونی تەمەندا.
- پێوەرەکانی جیاوازی (ڤاریەنس) خەسڵەتەکانی نێو خودی یەککەس پشت بە هاوکێشەی پەیوەستبون دەبەستێت لە نێو خەسڵەتەکاندا (معامل ارتباط).
- پەیوەندی نێوان ئەوەی کە تێستی توانا تایبەتەکان دەیپێوێت لەگەڵ تواناکانی تردا سفرە، واتە ئەو تێستانەی کە توانا تایبەتەکانی وەکو توانای مۆسیقی یان وەرزشی یان هونەری دەپێوێت پەیوەندیان بەیەکەوە سفرە، ئەمە جگە لەوەی کە پەیوەندیان بە توانای زیرەکی

---

[4] Variance،تباين

گشتیەوە هەر سفرە واتە پەیوەندیان نییە. چونکە توانایەکی بەرز لە یەکێك لەو توانا تایبەتانەدا لەوانەیە هاوشانی نزمی یەکێکی تر بێت لە تواناکان، ئەمەش بەلگەیەکی ئاشکرایە لەسەر بونی جیاوازی خەسڵەتەکان لە نێو خۆی یەك کەسدا(الزعبی، ٢٠١٥ لا ٤٩_٥٨)

# بەشی چوارەم

جیاوازی نێوان گروپەکان
جیاوازی تاکایەتی لە پێکهاتەی کەسێتیدا
جیاوازی تاکایەتی و ڕەفتار
جیاوازی تاکایەتی لە پرۆسە عەقڵیەکاندا
جیاوازی تاکایەتی لە فێربونی زماندا
جیاوازی تاکایەتی وخەسڵەت
جیاوازی تاکایەتی لە توانا هزریەکان و زیرەکی
جیاوازی نێوان گروپەکان
جیاوازی تاکایەتی لە کەسێتی و تواناکاندا
پێنج تایپە سەرەکیەکەی کەسێتی
تایپی کەسێتی (A , B)
تایپی ئەو کەسێتیانەی کە ژینگەی خۆیان دروست دەکەن.
تایپی کەسێتی مایکیاڤیلی

## جیاوازی نیوان گروپەکان

لەم بەشەدا کۆبیرمان دەخەینە سەر جیاوازی نێوان گروپەکان، گروپەکان بەهۆی نەریتە کۆمەڵایەتی و شارستانیەکانەوە جیاوازن، وەکو دەبینین گروپەکان لەسەر بنەمای ڕەگەز دابەشکراون بۆ دو گروپ(ژنان و پیاوان)، یان لەسەر بنەمای ئەو ناوچەیەی کە تیایدا دەژین پۆلێن کراون بۆ گروپی(شار و لادێ) یان گروپی(شاخنشین، دەشتنشین) یا گروپی (دانیشتوانی ناوچە ساردەکان، دانیشتوانی ناوچە گەرمەکان).

لەوانەیە لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی جیاوازی نێوان گروپەکان هاوکارمان بێت بۆ ناسینی جیاوازی نێوان تاکە کەسەکانیش. لەکاتێکدا بونی جیاوازی نێوان تاکەکان نیشانەیە بۆ بونی جیاوازی نێوان گروپەکانیش.

ئەو زەحمەتیانەی دێنە ڕێگای لێکۆڵینەوە لە جیاوازی نێوان گروپەکان

ئەو زەحمەتیو گرانیانەی لەم چوارچێوەیەدا دێتە سەر ڕێگای توێژەری بواری جیاوازی نێوان گروپەکان لەم خاڵانەدا دەست نیشانی دەکەین:

١. قورسی دیاریکردنی نمونەی توێژینەوەکە: کاتێك بەراوردی نێوان دو گروپ دەکەین لە سیفەتێکدا، ئەوەی بەلامانەوە گرنگە ئەوەیە، کە دەمانەوێت بزانین ئایا ئەم جیاوازیانە جیاوازی ڕاستەقینەیە یان ڕێکەوتە یان بەهۆی هەڵەی نمونەوە دروستبووە. ئەم هەڵەیەش ناو دەنرێت هەڵەی پێوەری (الخطاء المعياري). هەڵەی پێوەری ئەنجامی

جیاوازی هەردو گروپە پشت بە قەبارەی نمونەکە دەبەستێت، لەگەڵ بڕی بڵاوی نێوان تاکەکانی نمونەکە، تا بڵاوی[5] زیاتر بێت ئەوا هەڵەی معیاری زیاتر دەبێت. بۆیە گرنگە نمونەکە نوێنەری کۆمەڵە بنچینەییەکە بێتو ژمارەی زۆری نمونەکەش زۆر گرنگە لەگەڵ جۆری هەڵبژاردنەکەی بەشێوەیەکی هەڕەمەکی.

٢. زەحمەتی جیاوازی لە تێکڕای خێرای گەشەکردنی نێوان هەردو گروپەکەدا هەیە: لەوانەیە جیاوازی نێوان گروپی هەردو ڕەگەزەکە پەیوەندی بەجیاوازی تێکرای خێرای گەشەکردنیانەوە هەبێت، توێژینەوەکان ئەوەیان سەلماندوە، کە کچان زووتر لە کوڕان گەشە دەکەنو دەگەنە تەمەنی پێگەیشتن، لە منداڵیشدا کچان خێراتر لە کوڕان گەشە دەکەن، کچان زوتر دەگەنە قۆناغی هەرزەکاری بە نزیکەی ساڵێك یان دو ساڵ زووتر لە کوڕان، ئەو خێرایی گەشە کردنە تەنیا لە لایەنی جەستەییەوە نییە بگرە لایەنی عەقڵیش دەگرێتەوە، ئەمەش ئەوە ڕون دەکاتەوە بۆ لە قۆناغی سەرەتایدا کچان زۆرتر نمرە وەردەگرن لە تێستی زیرەکیدا بەبەراورد بە کوڕانی هاوتەمەنو هاوپۆلەکەی.

هەر سەبارەت بە جیاوازی نێوان نەژادەکان هەندێك لە نەژادە سەرەتاییەکان زووتر گەشە دەکەن لەڕوی جەستەییو عەقڵیشەوە. لێکۆڵینەوە لەسەر قۆناغی سەرەتای منداڵی قورسە، چونکە منداڵ زۆر بە خێرایی گەشەدەکات. بەڵام کەمو کورتیەکان زیاتر ئاشکرا دەبن بەگەورەبونیو گەیشتن بە قۆناغی گەنجیو پێگەیشتویی(ئانا ستازی، ئەوانی تر، ١٩٦٩)

---

[5] Dispersion coefficient

٣. زەحمەتیەکانی پەیوەست بە ئاستی رۆشنبیریو کۆمەڵایەتیو ئابووری گشتیەوە: زۆر هۆکار هەیە کاریگەری لەسەر ئەنجامی تێستی زیرەکی دروست دەکەن وەکو؛ دابونەریتو ئەو بۆچونانەی پەیوەستن بە پەروەردەوە. خوشکو برا کە لەهەمان ماڵدا گەورە دەبن، بەڵام زۆربەی جار بەهەمان بارودۆخدا تێپەر نابن. هەندێکجار زاڵکردنی رەگەزێك بەسەر رەگەزەکەی تردا پیادە دەکرێت ئەمەش کاریگەری لەسەر زۆربەی سیفاتی کەسێتیان دەکات. یان ئاستی رۆشنبیری هەندێك دەستەو بەرە نزمەو ئەوەش کاریگەری دەکاتە سەر وەڵامدانەوەیان بۆ تێستەکان. سەرباری ئەمانە بواری پەروەردەو خوێندن بۆ کورانو کچان وەك یەك فەراهەم ناکرێت. لە لایەکی ترەوە ئەوە سەلمێنراوە بە توێژینەوە، کە ئاستی کۆمەڵایەتیو ئابوری کاریگەری لەسەر ئاستی زیرەکی هەیە بەرێژەی (٠،٤٠).

## جۆرەکانی جیاوازی نێوان گروپەکان

١. جیاوازی نێوان رەگەزەکان لە هەندێك سیفاتی جەستەیی وەکو قەبارەی جەستەو بەهێزیەکەی، یان لە سیفاتی عەقڵیدا وەکو زیرەکیو توانا گشتیەکان، سیفاتی ویژدانی وەکو باوەر بەخۆبوونو شەرانگێزی.

٢. جیاوازی نێوان تەمەنەکان، ئەمە لەو گۆرانارییانەدا روودەدات کە بەپێی گەورەبونی تەمەن دروست دەبێت لەکەسەکاندا وەکو گۆرانکاری لە سیفاتی جەستەییو عەقڵیو ئاکاریو هەڵچونیدا.

٣. جیاوازی نێوان بەرەبابو نەژادەکان لەسیفاتی جەستەیی وەکو رەنگی پێستو قژو بەرگەگرتنو توانا عەقڵیەکاندا.

٤. جیاوازی لە نێوان ئاستی جیاوازی ئابوریو کۆمەڵایەتیەکان و ڕەنگدانەوەی لەسەر جۆری پەروەردەو سیفاتی کەسەکان.

لەبەر ئەوەی هەمیشە ئەم جیاوازیانە لە ئەنجامی کاریگەری بۆماوەو ژینگەیە بۆیە هیچ کاتێك ئەم جیاوازیانە جێگیرو نەگۆرو مەحاڵ نین، بۆنمونە ئەو کەسەی کە لە ژینگەکەیدا نامێنێتو دەگوێزرێتەوە بۆ ژینگەیەکی تر بەتایبەت لە منداڵیەوە زۆر سیفاتی گۆڕانکاری بەسەردا دێت. وەکو ئەو منداڵانەی کە دەبرێنە ناو خێزانی جێگرەوەوە.

ئەو تێستە دەرونیانەی بەکارهاتوون زۆرجار لەلایەن چینە ڕۆشنبیرو باڵادەستەکانەوە ئامادە کراون بۆیە لایەنگیری تیادا بووە لە بەرژەوەندی نەژادێك دژ بەهەندێك ڕەگەزو نەژادی دیکە هیچ دادپەروەری تیادا نەبووە. هەندێك لەو توێژینەوانە بەمەبەستی سیاسیو کۆمەڵایەتی لەبەرژەوەندی هەندێك دەسەڵات ئەنجامدراون بۆ نمونە(سەرکەوتنی سپی پێستەکان بەسەر ڕەش پێستەکان لە ئەمریکادا).

لەکاتی لێکۆڵینەوە لە هەندێك لەو گروپانە ڕەچاوی کەلتورو مێژویان نەکراوە وەکو بونی ئەفریقیەکان لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو بونی پەنابەران لە ئەمریکا بە ڕێژەی زۆر.

ئەوەی کاریگەری دەکاتە سەر ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوانە ئەو بۆچونە پێشوەختانەیە[6] کە لەسەر ئەو توێژانە دروست بووە، بۆ نمونە لای هەمو کەسێك وێنایەکی باو هەیە لەسەر ژن یان لەسەر پیاو، لادێنشین و شارنشین، سپی پێست و ڕەش پێست، لەسەر ڕۆشنبیری ڕۆژئاواو ڕۆشنبیری ڕۆژهەلات. ئەم بۆچونە پێشوەختانە شێوەی ڕەفتارو مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم توێژانەدا دیاریدەکات بەپێی ئەو پێشبینیانەی بۆیان هەیانە.

---

[6] stereotypes

## جیاوازی تاکایەتی لە پێکهاتەی کەسێتیدا

ئەوەی لە توێژینەوەکانی دەروونناسیدا لامان گرنگە کەسێتی مرۆڤەکانە، ئەوە سەرەتایە بۆ لێکۆڵینەوە دەروونییەکان، هاوکات ئەو ئامانجەشە کە دەروناسی کاری بۆ دەکات تا بیناسێت. لە پێناو توێژینەوەی کەسێتیو چالاکیە جۆربەجۆرەکانی؛ زمانەوانی، جوڵەیی هزری...هتد زانستی دەرونزانی جۆرەها لقی لێبۆتەوە وەك ئەنجامێکی حەتمی بۆ ئاڵۆزی پێکهاتەی کەسێتیو ئاڵۆزی جۆراوجۆری ئەو بوارانەی کە چالاکی تیادا ئەنجامدەدات. کەسێتی وەك بونەوەرێکی کۆمەڵایەتی هەر دەبێت لەناو گروپی جودا جودا بژیو لەگەڵیاندا کارلێك بکاتو کاریگەری لەسەریان دروست بکات و خۆشی پێیان کاریگەر ببێت، بۆچونو بەهای تایبەت بەخۆی هەبێت، کە بواری توێژینەوەی زانستی دەروونناسی کۆمەڵایەتییە، کەسێتی وەکو ئەوەی کرێکارێك لە کارگەیەکدا لەگەڵ ئامێرەکاندا مامەڵە دەکات، خۆی بۆ ئەو بارودۆخە دەگونجێنێتو ئەوانیش بە پێی پێویستیەکانی خۆی دەسازێنێت. ئەمە دەروونناسی پیشەسازی لێی دەکۆڵێتەوە، بەڵام دەروونناسی گەشە لێکۆڵینەوە لەو گۆڕانکاریانە دەکات کەبەسەر کەسێتیدا دێت لە ڕوی چالاکیو تایبەتمەندیو تواناوە بە پێی گەورە بونی تەمەن. کەسێتی وەك بونێك گەشەدەکاتو فێردەبێت ئەو شارەزاییو ئەزمونانە وەردەگرێت، کە کۆمەڵ بەلایەوە گرنگە ئەوەش بواری توێژینەوەی دەروونناسی پەروەردەییە. بەو جۆرە دەبینین، کە دەروونناسی دەبێتە چەندین لق بەهۆی جۆراو جۆری بواری چالاکی کەسێتی مرۆڤەوە (الشیخ، ٢٠١٤،لا٢٣).

جیاوازی تاکایەتی هەمو لایەنەکانی چالاکی کەسێتی دەگرێتەوە. بەڵام با سەرەتا بزانین مەبەستمان لە کەسێتی چییە؟ گرنگترین ئەو لایەنانەی کە

کەسەکان تیایدا جیاوازن چین؟ ئەلبۆرت بەم شێوەیە پێناسەی کەسێتی دەکات:" کەسێتی ڕێکخستنێکی دینامیکیە لای تاکەکەس بۆ کۆی پێکهاتە جەستەیی‌و دەرونییەکانی کە بەهۆیەوە شێوازی خۆسازاندنی کەسەکە لەگەڵ ژینگەکەی دیاری دەکات" (الامارە، ٢٠١٤, لا٤٢).

مەبەستمان لە کەسێتی یەك سیستمی یەکترتەواوکەری یەکگرتوە لە خەسڵەتە جەستەیی ودەرونییەکان، تا ڕادەیەك جێگیرە، کە تاکەکان لەیەکتر جیا دەکاتەوە، شێوازی چالاکیەکانیان دیاریدەکات، لەگەڵ چۆنیەتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ژینگەی دەرەوە(مادی وکۆمەڵایەتی)دا، یەکانەیی وبێوێنەیی(التفرد) کەسێتی کێشەی بۆ توانای لێکۆڵینەوەی زانستی لە کەسێتیدا دروست کردووە. بۆچونێك هەیە پێی وایە ئەم بێوێنەییەی کەسێتی وادەکات کە توێژینەوەی کەسێتی بەشێویەکی زانستی وبابەتیانە مەحاڵ بێت، بە ئامانجی گەیشتن بەو یاسا گشتیانەی کە بۆ هەمو مرۆڤەکان گونجاو بێت، بۆیە دەڵێن ئەوە هونەرمەندەکانن، کە دەبێت وەسفی کەسێتی بکەن نەك زاناکان. ئەوان دەتوانن وێنای ئەو بێوێنەییەی کەسێتی بکەن، بەڵام زەحمەتە ئەم بۆچونە پەسەند بکەین، چونکە پەسەندکردنی بەواتای ئەوەیە کە دەرونناسی کەسێتی بخەینە لاوە وەکو لێکۆڵینەوەیەکی زانستی هیچ باسی نەکەین(الشیخ، ٢٠١٤، لا٢٣)

لەڕاستیدا کێشەی بێوێنەیی کەسێتی لە ناوازەیی وبێوێنەیی بایۆلۆژی زەحمەتتر نییە، کاتێك کۆمەڵە هۆکارێکی(بۆماوەیی، ژینگەیی)سەربەخۆ یان بەیەکەوە کارلێك بکەن بۆ دروستبونی ئاسەوارێکی دیاریکراو. ئەنجامی حەتمی ئەو بێوێنەییە دەبێت لە کەسێتیدا. نمونەی ئەو بێوێنەییە وەك لە مۆری پەنجەدا دەردەکەوێت کە مۆری پەنجەی هیچ کەسێك لە کەسێکی تر ناچێت. کەچی ئەوە ڕێگری دروست نەکردوە لە بەردەم توێژینەوە

ولێکۆڵینەوە لێی، ئێمە لە توێژینەوەکانماندا بۆ کەسێتی لە زۆر لایەنەوە دەیگرینە دەست. شیدەکەینەوە بۆ کۆمەڵە تایبەتمەندی وسیفەتێك، ئەو تایبەتمەندیانەش تەنها وەسفکردنن بۆ ڕەفتاری تاکەکەسەکە، خەسڵەت[7] وەکو زاناکان پێناسەی دەکەن بریتیە لە شێوازی ڕەفتارکردن، کە زۆر دیار و تارادەیەکیش جێگیرە، بەهۆیەوە کەسێك لە کەسەکانی تر جیا دەکاتەوە.

لەبەرنەوەی ئەو لایەنانەی، کە کەسەکان لەیەکتر جیا دەکاتەوە زۆر زۆرە، بە جۆرێك کە نەتوانین سنوری بۆ دیاریبکەین، بەلاّم لە ڕێگەی توێژینەوەی ئاماری بابەتیەوە دەرکەوتوە، کە جیاوازییە تاکایەتیەکان تارادەیەك بەیەکەوە پەیوەستن بە جۆرێك، کە ڕێگە بدات بە دیاریکردنی خەسڵەت وتایبەتمەندییە زۆر گشتیەکان، دەتوانین ئەو خەسڵەتانە بۆ دو گروپی سەرەکی پۆلێن بکەین:

**یەکەم: کۆمەڵە تایبەتمەندیەکی جەستەیی:** ئەوەش پەیوەندی بە گەشەی جەستەیی گشتیو تەندروستی گشتیەوە هەیە دەتوانین تیایدا خەسڵەتە گشتیەکانی تەندروستی گشتی جیا بکەینەوە لە سیفاتە تایبەتەکان، وەکو بالاّو کێش و یان هەندێك کەموکورتی ونەنگی جەستەیی.

**دووەم. کۆمەڵە تایبەتمەندیەکی پەیوەست بە ڕێکخستنی دەرونی لە** کەسێتیدا، کە ئەمە زۆر بەلامانە گرنگە لە خوێندنی جیاوازی تاکایەتیدا. ڕێکخستنی دەرونی بریتیە لە سیستمێکی تەواوی خەسڵەتی دەرونی، کەکەسەکان جیا دەکاتەوە لەیەکتر لە کاتی مامەڵەکردنیان لەو هەڵوێستانەدا کە ئامانجی ژیانیان دیاریدەکات. ئەمە جگە لە جیاکردنەوەی ڕەفتارو

---

[7] trait

شێوازی خۆگونجاندنی لەگەڵ دۆخە ماددی وکۆمەڵایەتییەکەدا،و دیاریکردنی چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ کەسانی چواردەوریدا (الشیخ، ٢٠١٤، لا٢٣٢)

### زاناکان دو پێکهاتەی دەرونی بۆ کەسێتی لەیەکتر جیا دەکەنەوە:

یەکەمیان بە ڕێکخستنی هزری یان عەقڵی دەناسرێت، ئەویش بەندە بە تێگەیشتنو درککردنی تاکەکەس لە جیهانی دەرەوەی خۆی، تێگەیشتنو درککردنی بابەتەکانی هاوشێوەیی‌و جیاوازی‌و ناکۆکی نێوان ئەو بابەتانە، توانای بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانەی دێنە بەردەمی.

دوەمیان بە ڕێکخستنی هەڵچونی دەناسرێت: ئەم ڕێکخستنە تیادا هەمو شێوازی چالاکییە هەڵچونەکان کۆدەبێتەوەو ڕێکدەخرێت، ئەمەش پاڵنەرو ئاراستەو بۆچون دەگرێتەوە لەگەڵ چۆنیەتی ڕوبەروبونەوەی هەڵوێستە جیاوازەکان.

کاتێك گرنگی بە توێژینەوەی ڕێکخستنی هزری دەدەین لای تاك، دەمانەوێت وەڵامی ئەم پرسیارە سەرەکییە بدەینەوە؛ ئەم کەسە دەتوانێت چی بکات؟ تواناو ئامادەییەکانی چین؟ بەڵام کاتێك گرنگی بە ڕێکخستنی هەڵچونی دەدەین، دەمانەوێت ئەم پرسیارە وەڵام بدەینەوە: بۆچی بەم شێوازە مامەڵە دەکات؟ یا چەند بڕوای بەخۆی هەیە؟ ...هتد.(الشیخ، ٢٠١٤، لا٢٣٢)

جیاوازی تاکایەتی لە هەمو خەسڵەتە جەستەیی‌و دەرونیەکانی کەسێتیدا دەبینرێتەوە، ئەگەر بۆ نمونە لە ڕوی باڵاوە مرۆڤەکان لەیەکتر جیا بکەینەوە دەبینین کەسی زۆر باڵا بەرز، باڵا بەرز، مامناوەند، کورت، زۆر کورت. هەیە. بەهەمان شێوەش بۆ خەسڵەتی زیرەکی‌و هەڵچونی، ئەی ئەگەر خەسڵەتی کەسێتی کراوە یان داخراو وەربگرین دەبینین مرۆڤ هەیە داخراوە

هەیە کراوەیە، لە نێوان ئەم دو خەسڵەتەشدا خەتێك هەیە کە دەکرێت لە زۆرەوە بۆ کەم بڕوات (الشیخ، ٢٠١٤، لا٢٣٢).

کەسێتی کراوە + – کەسێتی داخراو



**کەسێتی لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە لەمانەی خوارەوەدا :**

١. لەبەر ئەوەی کەسێتی ئەو ئامادەباشیەیە کە وەڵامی تاك بۆ وروژێنەرە جۆراو جۆرەکانی چواردەوری دیاریدەکات، لێرەوە تاکەکان لەیەکتر جیاوازن لە ئاستی وەڵامدانەوەیان و ئامادەییان و پەرچەکرداریان بۆ وروژێنەرەکان، لەمەوە جیاوازی نێوان تاکەکان دەردەکەون بە پێی تایپی کەسێتی و پێکهاتەکانی.
٢. جیاوازی نێوان تاکەکان لە ڕوی چۆنیەتی خۆگونجاندنیان لەگەڵ ژینگەی چواردەوریان.
٣. خۆگونجاندنی تاك لەگەڵ ژینگەکەیدا لەوانەیە بە ئەرێنی بێت یان نەرێنی بێت، لەوانەیە لە ئاستێکی بەرزدا بێت یان مامناوەند یان لاواز، ئەمە بریتیە لەو هەوڵانەی کە هەمو کەسێك دەیدات بۆ خۆسازاندن و کارلێکی لەگەڵ ژینگەکەی لە واقعی ئێستایدا یان وەکو چۆن لە خەیاڵیدا هەیە. لەم بوارەدا جیاوازی نێوان کەسەکان زۆر دەردەکەوێت(الامارە، ٢٠١٤، لا ٤٣)

**جیاوازی نیوان تاکەکان لەم لایەنانەوە دەردەکەوێت:**

تەندروستی گشتی. ڕواڵەت و لایەنە جەستەییەکان، لایەنی بەهێزو لاوازی، بونی کەموکورتی و نەنگی جەستەیی یان بێتوانایی، ڕژاندنی کوێرە

ڕژێنەکانو ڕژێنەکانی ترو ئەرکی ئەندامەکان، چالاکی هەستیو جوڵەیی(طلعت منصور و ئەوانی تر).

**جیاوازی لە کەسێتیدا بەڕونی لەم خاڵانەدا دەردەکەون:**

لایەنی هەڵچونی بە گشتیو هاوسەنگی هەڵچونی بە تایبەتی. خەسڵەتە تایبەتەکان وەك(کراوەییو داخراوەیی، ملکەچی، باڵادەستی، شەڕانگێزی، ئاشتی خوازی، بۆچون یان ئاڕاستە، بەهاوسۆز، هەڵچونەکان، ئاستی دەستکەوتی خوێندنی، زانیاری گشتی، شارەزایی، ئەزمونی کۆن، توانا هزریە گشتیەکان، توانا هزریە تایبەتەکانی وەکو؛ بیرکاری، وەرزشی، ژمێرەیی، میکانیکی، زمانەوانی، هونەریو ئاستی داهێنان).

## جیاوازی ئاکایەتی و ڕەفتار

ئەگەر بمانەوێت بزانین ڕەفتار چییە؟ ئەوا گەلێك پێناسەمان دەست دەکەوێت بۆ نمونە فەرهەنگی دەرونناسیو شیکاری دەرونی بەم شێوەیە پێناسەی دەکات:" ئەو چالاکیانەیە کە ئەندامەکانی جەستەمان ئەنجامی دەدات، لەوانەیە بە کۆبیرخستنەسەری هەستی پێبکەین وەك؛ لێدانی دڵمان یان هەناسەدان، بەڵام لەوانەیە بۆ هەندێك لە چالاکیەکانی تر نەتوانین هەستی پێبکەین ئەگەر چەند هەوڵیش بدەین وەکو ؛ دەردراوەکانی ناو گەدە، دەردانی شەکر بۆ ناو خوێن کاتی هەستکردن بە مەترسی(طه و الآخرون، ١٩٩٣).

هەندێك زانا وەها پێناسەی ڕەفتار دەکەن کە؛ بریتیە لە چالاکیەکی گشتگیری ئاوێتە تاك پێی هەڵدەستێت کە هەندێکجار بەشێکی پرۆسەکەیە یان تەواوی پرۆسەو جوڵەکەیە(منصور و لآخرون، ٢٠٠٢).

کەواتە ڕەفتار ئەم لایەنانە دەگرێتەوە؛ زانین، درککردن، هەستی، هەڵچونیو جوڵەییو ئیجرائی، دەروناس(دانییل لاجاش) دەڵێت ؛ " مەبەستمان لە ڕەفتار هەر ڕواڵەتە دەرەکیو مادیە ڕوتەکە نییە بەڵکو کۆی تەواوی کردە فسیۆلۆژی، دەرونی، زارەکیو جوڵەییەکانە، کە تاکەکەس پێی هەڵدەستێتو پەیوەستە بە ژینگەکەیەوەو هەوڵە بۆ کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێکانیو بەدیهێنانی تواناکانی، هەمو ڕەفتارێك واتادارەو ئامانجێکی لەپشتەوەیە بەتایبەت ئەگەر توانای هەبێت بۆ کەمکردنەوەی دڵەڕاوکێ و بیرکردنەوەکانی لە پێناو خۆسازاندنی لەگەڵ ژینگەکەدا.

شێوازی ڕەفتاری تاکەکان لەیەکتر جیاوازن لە زۆر ڕوەوە وەکو؛ پاڵنەر بۆ بابەتێك، یان لێهاتویی تایبەتی تیایدا، یان شارەزایی تایبەتی بۆ بابەتەکە، چۆنیەتی تاوتوێکردنی(معالجە) بابەتەکە کە لە هاوپۆلی خوێندنو هاوتەمەنەکانی خۆی جیای بکاتەوە، ئەم لێهاتوییو توانایانەیە کە دەروناسەکان پێی دەڵێن(تەمەنی پێگەیشتویی).

چەمکی پێگەیشتن بریتیە لەو ئامادەباشیانەی تاك هەیەتی بۆ دەرکەوتنی کتوپری ڕەفتاری نوێ کە لە ئەنجامی ڕاهێنان نەبوبێت، دەرکەوتنی ئەو گۆڕانکاریو ڕەفتارە نوێیانە بەیەك ڕێزبەندیە لە جۆری بونەوەرەکاندا، واتە پێگەیشتن بریتییە لە گەشەی ناوەکی مرۆڤ کە مرۆڤ خۆی کۆنترۆڵی ناکاتو ئیرادەی بەسەریدا ناشکێت، جیاوازی نێوان تاکەکان لەم بوارەدا زۆر ئاشکراو دیارە لە هەڵوێستە جۆراو جۆرەکانی ژیاندا دەردەکەوێت.

پرنسیپی جیاوازی تاکایەتی لە ئەنجامی کارلێکی هەردو هۆکاری بۆماوە وژیگەیە لەسەر گەشەکردنی مرۆڤ کە هەندێکجار زۆر خێرایە لە هەندێك لە کەسەکاندا، یان ئاساییە لای زۆرێك لە خەڵك یان زۆر هێواشە لای هەندێکی تریان.

## جیاوازی تاکایەتی لە پرۆسە عەقلییە باڵاکاندا

درككردن، بیرکردنەوە، یادهێنانەوە، بەئاگابوون، بیرچوونەوە:

کاتێك لێکۆڵینەوە لە لایەنی زانینی دەکەین جیاوازی نێوان تاکەکان بەئاشکرا دەردەکەوێت، ئەمەش وا دەکات پێوانەکردنی ئاسان بێت، و پێشبینی بکرێت کە مرۆڤەکان بەسەر جۆرەها شێواز لەم شێوازانەدا دابەش بووبن، یاسای گەشەکردن ئەوەدەخاتە ڕوو کە شێوازە زانینیەکان توانای دابەشبونی هەیە بەشێوەیەکی سروشتی لەنێوان تاکەکانی یەك کۆمەڵ یان یەکگروپدا.

جیاوازی تاکەکەسی گرنگی دەدات بە لێکۆڵینەوەی چۆنیەتی پیادەکردنی تاکەکەس بۆ چالاکیە زانینیەکانی وەکو؛ خەیاڵ کردنەوە، بیرکردنەوە، درككردن، چارەسەری کێشەکان، چۆنیەتی بڕیاردان، ئەم جیاوازیانە جیاوازی چەندێتی نیین، بەڵکو جیاوازین لەشێوازو ڕێگای بیرکردنەوە، درككردن لەکاتی مامەڵەکردن لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا، ئەمەش جۆرێکی جیاواز بە کەسەکە دەبەخشێت لە بیرکردنەوەو درككردندا.

شێوازە مەعرفیەکان پەیوەندیان بە زۆر گۆڕاوەوە هەیە وەکو: پاڵنەر، زیرەکیو سەرکەوتنی ئەکادیمی، بەپشت بەستن بەو ئەرکەی کەسەکە ئەنجامی دەدات بە بونی جیاوازی لە نێوخودی تاکەکەو لە نێوان کەسانی چواردەوری.

زانای (سترنبرگ) ڕای وایە؛ کە ئاستەکانی تاوتوێی زانیاری وەکو عەممارکردنو دانانی کۆدو گەڕانەوەی زۆر گرنگە لە بابەتی جیاوازی نێوان کەسەکاندا، ئەو جیاوازیانەش زۆر بە جوانی دەردەکەوێت لە ڕێگەی تاوتوێی مادی یان بیستنی یان تاوتوێی واتایی بۆ وروژێنەری بیستنی و بنینیەکان بەیەکەوە، هەروەها لە پرۆسە زانینیەکانی تریشدا.

## جیاوازی تاکایەتی و فێربونی زمان

زمان ئەو تایبەتمەندیەیە کە مرۆڤ لە بونەوەرەکانی تر جیا دەکاتەوە، تا ئێستاش زمان بنەمای سیستمی کۆمەلآیەتیو ئامرازی گواستنەوەی زانیاری بەیەکگەیشتنی نێوان مرۆڤەکانە، وە نوسینەوەی مێژوو و کەلەپورە لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر. لە زانستی دەرونناسیدا لقێك لە یەکگرتنی زانستی زمانو زانستی دەرونناسی دروستکردوە کە ناوی(سایکۆلنگویستك)ە واتە دەرونناسی زمانەوانی. گرنگی بە بابەتی پێکهاتەی زمان، چۆنیەتی فێربونو بەکارهێنانو تێگەیشتنی دەدات.

منداڵ زۆر زوو فێری زمان دەبن وەکو هەندێك لە تیۆرەکان لێکی دەدەنەوە بەهۆی ئەوەی هەر لە ساواییەوە ئامادەیی خۆڕسکی لە مێشکیدا هەیە بۆ فێربونی زمان، ئەمەش لە بێچوی بونەوەرەکانی تر جیای دەکاتەوە. ئەوەش دەستکەوتێکی زۆر گەورەیە، جا لەبەر ئەوەی بەردەوام گوێبیستی قسەکانی چواردەریانن، لەوانەیە منداڵ فێری قسەکردن ببێت بێ ئەوەی پلانی بۆ دابنرێت یان ڕاهێنانی پێبکرێت، کەواتە فێربونی زمان شتێکی غەریزیە، کاتێك تێکەڵ بە کۆمەڵو کەسانی تر دەبین کە بەزمانی ئێمە قسەناکەن، ئەوا فێربونی زمانەکەیان زۆر کامەرانیمان پێ دەبەخشێت. لە فێربونی زمانێکی تر لە دەرەوەی زمانی دایك جیاوازی تاکایەتی زۆرتر دەردەکەوێت، لەوانەیە هەندێك کەس بەماوەیەکی کورت فێری ببێتو بەجوانی وەکو زمانی دایکیش قسەی پێ بکات. لەم سەردەمەدا ئەوە دەبیستین کەسان هەن کە بەچەند زمان قسە دەکەن بەباشیو هەیە هۆنراوەو چیرۆکیش بەو زمانەی فێری بووە دەنوسێت.

(لیندا دافیدۆف) دەڵێت؛" زۆرجار مرۆڤەکان وا بیردەکەنەوە، کە فێربونی زمان وەکو ئەوەیە، کە چۆن گوێبیستی کاسێتك دەبیت ڕستەو وشەکان

دەبیستیتو پاشان دەتوانیت هەمان شت عەممار بکەینو دوبارەی بکەینەوەو بەکاری بهێنین، بەلام مرۆڤ وەکو ڕیکۆردەر نیە، کە تەنیا ئەوانەی دەیبیستن دوبارەی بکەینەوە، چونکە جاری وا هەیە وەکو (ڕۆجەر براون) دەلێت کە؛" زمان خولقکاریو داهێنانی تیایە، لەوانەیە مرۆڤ ڕستەیەك بلێ کە هەرگیز نەیبیستوە لەکەسەوە، لەوانەشە وا پێویست بکات شتێك بلێ کە ئەو کەسانەی خۆیان بەو زمانە قسەدەکەن نەیانتوانیبێت بیلێن. زانای زمانەوانی بەناوبانگ(نعوم چۆمسکی) دەلێت؛" ڕۆلی فاکتەرە بۆماوەیەکان(جینەکان) ڕۆلێکی گرنگو بنەڕەتیە، بابەتە بیستراوەکان زۆرجار بەرچاو لێلدەکەنو پارچە پارچەو هەلەن، لەگەل ئەوەشدا مندال ڕێزمان فێردەبێت کە چۆن ڕستەیەکی باش دروست بکاتو بەکاریبهێنێتو گشتگیری بکات.

تێگەیشتن لە زمانێکی بیانی بە واتای بەکارهێنانی پرۆسە عەقلییەکان بە شێوەیەکی سەرکەوتوو بۆ تێگەیشتن لە دەقێك لە ڕێگەی ڕاست درککردنیەوە پاشان بەهێماکردنی پاراستنو عەممارکردنی، لەو ڕوانگەیەوە کە تێگەیشتنی تاکەکان بۆ دەقێك لەیەکتر جیاوازە، هەر یەکە بەجۆرێك تێدەگات ئەویش بەهۆی جیاوازی تاکایەتیە لە تواناکاندا. پێوەر هەیە کە جیاوازی تاکەکان دەپێوێت لە تێگەیشتنی واتا، هەیە بۆ پێوانەکردنی توانای زارەکی، هەیە ئاستی توانای ڕەوانی دەپێوێت(الأمارة، ٢٠١٥، لا ٦٢).

## جیاوازی تاکایەتی و خەسلەت[8]

بەشێویەکی گشتی خەسلەت ئەو تایبەتمەندیانەیە کە تاکەکان لەیەکتر جودا دەکاتەوە، بەلام ئەوەی لێرەدا باسی دەکەین خەسلەتی کۆمەلایەتیو

---

[8] trait

پەیوەندی کۆمەلاّیەتی، و ڕابەرایەتیو پێویستی زانینی درککردنی کۆمەلاّیەتییە.

ئاشکرایە کە قەبارەی پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکان کاریگەری لەسەر هەمو لایەنێکی ژیانی کەسەکان دەکات، تاکەکان بەم خەسلّەتانە لەیەك جیادەکرێنەوە وەکو پەیوەندییە کۆمەلاّیەتیەکان، ڕابەرایەتیو پێداویستی زانینی، درککردنی کۆمەلاّیەتی. پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکان واتە پەیوەندییە گشتیەکان، جاری وا هەیە بەباشو هەندێکجاریش بە خراپ وەسف دەکرێت بە پێی ئەو باوەڕەی کە هەردو لایەنی پەیوەندیەکە بەیەکتریان هەیە، یان ڕێزگرتن وهاوکاری یەکتری هەندێك کەس پەیوەندی وکارلێکی کۆمەلاّیەتی زۆر فراوانی هەیە، کەسەکان چۆن مامەلّەی یەکتر دەکەن بەو مامەلّەکردنە چۆن بە بۆچونەکان کاریگەردەبن وکاریگەری لەسەر بۆچونیشی دروستدەکەن، بێگومان هەمو کەسێك توانای پەیوەندی دروستکردنی نییە، کەسێتیەکی داخراو ئەو پەیوەندیو کارلێکە کۆمەلاّیەتییە فراوانە ناتوانێت دروست بکات(الأمارة، ٢٠١٥،لا ٦٥).

دیارە خەسلّەتی تاکەکان ڕۆلێکی گەورەی لەدروستکردنی پەیوەندییە کۆمەلاّیەتییەکانو درککردن بەشێوەیەکی جیاواز لەوانی تر هەیە، هەروەها لە ڕابەرایەتیکردندا، هەندێك کەس دەبنە ڕابەر لە هەندێك هەلّوێستی کۆمەلاّیەتیدا، کەسێك دەتوانێت پێویستیەکان پڕبکاتەوە ئەوەش وادەکات کە ببێتە ڕابەر، هەلّوێستە کۆمەلاّیەتییەکان هەندێکجار خەسلّەتی ڕابەرایەتی لە کەسەکەدا دەردەخات. کە خۆی لەم خالاّنەدا دەبینێتەوە:

- ✓ دەستپێشخەرن لەپەیوەندییە کۆمەلاّیەتیەکاندا
- ✓ توانای ڕێکخستنیان هەیە.

✓ هاوشێوەیی لەگەڵ ئەو گروپەی ڕابەریان دەکات(الأمارة، ٢٠١٥،لا٦٦).

## جیاوازی تاکایەتی لە توانا هزریەکانو زیرەکیدا

دەروونناسەکان لەسەر پێناسەیەکی یەکگرتوو بۆ زیرەکی ڕێکنەکەوتوون، لەبەر ئەوەی تێکەڵیەك هەیە لەگەڵ کۆمەڵە فاکتەرێکدا کە ئاسانکاری بۆ گونجاندنو سازاندن دەکاتو یارمەتی دۆزینەوەی چارەسەری بۆ کێشەکان دەکات.

بەڵام ئەو دەستنیشانکردنە زۆرو جیاوازانەی کە بۆ زیرەکی کراوە، هەمویان دەکەونە سەر ڕێرەوی دەستنیشانکردنێکی یەکگرتووی زیرەکی. دیارە هەر دەستنیشانکردنێکی زیرەکی لەڕوی دەرکەوتوویی یەکێك لە لایەنەکانەوە گیراوەتە دەست، بۆیە پێویست ناکات وەکو کێشە سەیری ئەو هەمو پێناسە جیاوازانەی زیرەکی بکەین، بەڵکو وەکو ئەوە سەیری بکەین کە سەرچاوەی دەوڵەمەندکردنو زیادکردنی زانیاری نوێیە لەسەر سروشتی زیرەکی.

لە کۆنەوە زیرەکی وا ناسراوە، کە توانای تێگەیشتنو زانینە ئامرازێکی دەربڕینە(ئەمەش زیرەکیەکی روتی تایبەت بە مرۆڤە)، بەڵام لەگەڵ دۆزینەوەی ئەو گیاندارانەی کە توانای چارەسەرکردنی کێشەیان هەیە، وای لێی هات زیرەکیش وەکو سیفەتێکی گیانداریش سەیر بکرێت. زیرەکی بوو بە توانای چارەسەرکردنی کێشە جیاوازەکان، کە بەپێی کەس وجۆری بونەوەران دەگۆڕێت. هەیە زیرەکی تەنیا بە توانای خۆسازاندنی جەستەیی (بایلۆژی) سنوردار کردووە، تێبینی بکەن گیاش توانای خۆسازاندنی هەیە، زیرەکی پێش هەموو شتێك هەڵبژاردنو توانای جیاکردنەوەیە، نەك ڕەفتارێکی کوێرانەی بێ ئامانج هەتا ئەگەر بۆ خۆسازانیش بێت.

ئەگەر هەندێك لەو پێناسانە زاناكان كردویانە بۆ زیرەكی بخەینە ڕوو باشتر دەتوانیت لەم چەمكە تێبگەین:

پێناسەی هرتمان: "زیرەكی توانای گونجاندنی ئامرازەكانە لەگەڵ ئامانجەكاندا". ڕەخنەی سەر ئەم پێناسەیە ئەوەیە، كە ئەم پێناسەیە بۆ غەریزەكانیش دەگونجێت، بولبولێك كاتێك هێلانەكەی دروست دەكات ئەویش ئامرازی تایبەت بۆ گەیشتن بە ئامانجەكە بەكاردەهێنێت.

پێناسەی كلارباید:" زیرەكی توانای خۆگونجاندنە لە هەڵوێستە نوێیەكاندا" ئەم پێناسەیە تەركیزی خستۆتە سەر جیاكرنەوەی زیرەكی لە ڕۆتین (عادەت) كە یارمەتیمان دەدات بۆ چارەسەری ئەو كێشانە كە پێشتر ڕاهێنانمان لەسەر كردووە.

سرستۆن بەم شێوەیە پێناسەی كردووە:" زیرەكی دیاریكردنی قورسە، بەڵام دەكرێت لەڕێگەی ڕەفتارەوە سەرنجی بدەین، چونكە ئامرازێكی گونجاندنە. زیرەكی لە قوتابخانەدا پشت دەبەستێت بەوەی فێرخوازەكە دەتوانێت بە خێراییو بە ئاسانی چی بەدەست بهێنێت لە خوێندنكەی. وەكو ئەوەی كە واتای وشە ئەبستراكتەكان بزانێت، لەڕاهێنانی سەر وشەو واتاكانیدا دەربچێت. زیرەكی لەدەرەوەی قوتابخانە دەتوانین هەتا لە یاری تۆپی پێدا ببینین، لە كاتی پلاندانانو هەڵسەنگاندنی ئیشو كارەكاندا ببینیرێت, یان لەخێرایی قۆستنەوەی هەلی گونجاودا.

پیـاژە:" گرنگـی بـە لێكۆڵینـەوەی زیرەكـی لـەڕوی پێكهاتـەوە داوە، پێـنج قۆنـاغی بـۆ گەشـەكردن دیـاریكردوە، بـەڵام پیـاژە پێـی وایـە كـە زیرەكـی شێوەیەكە لە شێوەكانی خۆسازاندنی پێشكەتوو، بەڵام تەنها بە هۆی پرۆسەی وەرگـــــرتن(Assimilation) و گونجاندنـــــــەوە(Accommodation) پێشـناكەوێت یـان كتـوپر دەرناكـەوێت، زیرەكـی پرۆسـەیەكی هاوسـەنگی

بەردەوامە، کۆششێکی نەپساوەیە بۆ داخڵکردنی شتی نوێ بۆ چوارچێوەی بونیاتی عەقڵی کە پێشتر هەبووە. لەگەڵ هەوڵدان بۆ دروستکردنی بونیاتی تازەی زۆر کامڵ ترو پێشکەوتووتر، پرۆسەی دروست بونی زیرەکی پرۆسەیەکی بەردەوامە، چونکە هەمو ئەزمونێکی تاك پێدا تێدەپەرێت بەشداری گەشەی زیرەکیەکەی دەکات. زیرەکیش لە کۆتایی کاروانی دروستبونیدا بریتیە لە توانای تێگەیشتن لە ڕەنگدانەوەی هەڵوێستەکان[9].

برغستون: زیرەکی بەرهەمی پێشکەوتنی داهێنەرانەیە، مرۆڤ جیاواز لە بونەوەرەکانی تر زانینی خۆڕسکی نییە، هەروەها ئەو هۆکارانەی بەرگری لە مانەوەی خۆی پێبکات بە خۆڕکسی نییەتی. بۆیە ئەو ناچارە بگەڕێت بەدوای ئەو هۆکارانەدا کە توانای خۆسازاندنی پێ دەبەخشێت، لەکاتێکدا گیانەواران ئەو ئامرازەی بۆ خۆسازاندن بەکاری دەهێنن درێژەی بایلۆژی جەستەیانە، بەڵام لای مرۆڤ ئەو ئامرازەی بەکاری دەهێنێت بۆ خۆگونجاندنە و داهێنانی خۆیەتی.

بەپێی بۆچونی برغستون زیرەکی بەرهەمی خۆسازاندنە کە هەر دەچێت وردەکاریو ئاڵۆزیو نەرمیێتی زیاتر دەبێت. زیرەکی ئەو بەئاگابونەیە بۆ بیرکردنەوە لە مادده.

کاتێك پرسیاریان لە زانا بینیە کردوە؛ زیرەکی چییە؟ وتویەتی زیرەکی ئەوەیە کە.پێوەرەکانم دەیپێوێت. بە بۆچونی بینیە زیرەکی تا ڕادەیەکی زۆر خۆڕسکە. مەبەستیشی بووە ئەو زیرەکیە خۆرسکە بپێوێت کە وەرنەگیراوەو سەربەخۆیە لە عاداتو ڕاهێنان.

سپیرمان: توانای درککردنی پەیوەندی نێوان شتە مادییەکانە کە لە شوێنێکدا هەن(زیرەکی کرداری)، لەگەڵ پەیوەندی بیرۆکە ئەبستراکت

---

[9]تعاكس الموقف

وڕوتەکان (زیرەکی تیۆریو چەمکی). نمونەی ئەو پەیوەندیانە وەکو: پەیوەندی هاوشێوەیی (لەیەکچونی دو چەمك لەیەکتر)، جیاوازی (جیاوازی دو تیۆر لە یەکتر، هۆکاری (زیرەکی هۆکاری دەستکەوتی خوێندنە)، دژبەری، ناکۆکی...هتد.

کەواتە زیرەکی بریتیە لە وردی سەرنجدانو بیرکردنەوەی ئاشکراو ڕێکخستوو، کە پشت بە زانیاری وەرگیراوی پێشوتر نەبەستێت. توانای تێگەیشتن لەشێوە بێماناکانو درککردنی پەیوەندی نێوانیان، توانای بڕیار وەرگرتن بەزویی بەشێویەکی وردوگونجاو لەگەڵ هەلۆێستەکەدا.

## بەکورتی

دیاریکردنی چەمکی زیرەکی ئاسان نییە، ئێمە ناتوانین جیای بکەینەوەو پاشان بیخەینە ژێر مایکرۆسکۆبەوە تا شیبکەینەوە، ئەزمونی لەسەر بکەین. دەتوانین تەنیا سەرنجی زیرەکی بدەین کە ئەرکی خۆی بەجێدهێنێتو کارەکانی دەکات، هەمو ڕۆژێك لە ڕەفتاری خەڵکدا دەیبینین. زیرەکی هۆکارێکە لە هۆکارەکانی ڕەفتار. ئامرازێکە لە خزمەتی خۆسازاندندا.

خوێندکاری زیرەك ئەو کەسەیە کە دەتوانێت بەئاسانی لە خوێندنەکەیدا سەرکەوتوو بێت بەسەر هاورێکانی کە هاوتەمەنی ئەون.

زیرەکی زۆر هۆکاری هەیە بۆ دەربڕین، ئەو تەنیا بەو پرسیارانەوە سنوردار نابێت کە لە کاتی ئەزمونەکاندا لە خوێندکارانی دەکەین. فێربونی قسەکردنو چاککردنەوەی ڕادیۆ، یاریکردنی شەترەنج، یەکلایکردنەوەی وتووێژەکان، ئەمانە هەموی شێوازی ڕەفتاری زیرەکن. هەمویان هۆکاری چارسەرکردنی کێشەن، لەگەڵ مامەڵەکردنی هەلۆێستە قورسە تازەکان کە توشی مرۆڤ دەبێتو هەوڵی ئەوە دەدات کە زاڵ بێت بەسەریدا. بەواتا

فراوانەکەی زیرەکی توانای بەردەوامی ڕۆیشتنە لەم جیهانە ئاڵۆزەدا بەسەرکەوتویی، لە واتا تەسکەکەیدا واتا سود وەرگرتن لە ئەزمونەکانی پێشووتر خۆ ئامادەکردن بۆ ئەزمونی نوێ.

لە ئەنجامی تێبینیەکانی ڕۆژانەمان بۆ زیرەکی، دوخاڵی گرنگمان بۆ دەردەکەوێت.

١. هەندێك کەس لەوانی تر زیرەکترن.

٢. زۆربەی کەسەکان لە لایەنێك لە لایەنەکاندا زیرەك ترن وەك لە لایەنەکانی تر.

کاتێك بەمنداڵێك یان بە کەسێکی پێگەیشتو دەڵێن ئەم کەسە ئاستی زیرەکی بەرزە ئەوە زۆر شت دەگەیەنێت وەکو زوو تێگەیشتن، سود وەرگرتن لە ئەزمونەکان، دەستکەوتی خوێندنی بەرز، داهێنان، بەم شێوەیە ئەم چەمکە کۆکراوەی کۆمەڵە لێهاتویی‌و سیفاتێکی عەقڵییە کە هاوکاری تاکەکەس دەکات بۆ سود وەرگرتن لە ئەزمونەکان، زاڵ بون بەسەر کێشەکانی ژیانی ڕۆژانەیدا، لێرەوەیە دەتوانین بڵێن کەسی زیرەك - لەبەرامبە کەسی کەمتر زیرەك – بیرکردنەوەی ڕون‌و ئاشکرایە، زۆرتر سود لە ئەزمونەکان وەردەگرێت کە خۆی پیایدا تێپەر دەبێت یان کەسانی تر. زۆر زوو لە شتەکان تێدەگات. پەیوەندی نێوان شتەکان دەدۆزێتەوە. گرنگی بەو شتانە دەدات لە چواردەوری ڕوودەدات بۆیە دەتوانێت فرسەتەکان بقۆزێتەوە زیاتر بواری سەرکەوتن لەبەردەمیدا فراوانتر ببێت (الدیدی،١٩٩٧،لا٧٧-١٢). لە کوردەواریشدا دەڵێن (ئەوکەسە کەسە ئەلفێکی بەسە).

(تێستی راڤن) لە ڕێگەی پێوانەکردنی دوو پێکهاتەی سەرەکی زیرەکی دەپێوێت، ئەوانیش:

١. فراوانی هزری گشتی: ئەویش کاتێك تێستی بەهێزی دەدرێت بەکەسەکە بێ ئەوەی کاتی بۆ دیاریبکرێت. بەوەش ووردی سەرنجدان‌و ئاشکرایی‌و ڕونی بیرکردنەوەی دەپێویت، کە پشت بە زانیاری ڕابردوی نەبەستبێت.

٢. لێهاتویی هزری کەسەکە: ئەویش تێستی خێراییە، کات بۆ وەڵامدانەوەی کەسەکە دیاریدەکرێت. ئەوەش وەڵامدانەوەو بڕیاری خێرایی کەسەکە دەپێویت کە بۆ هەڵوێستەکە گونجاو بێت.

## جیاوازی تاکایەتی لە زیرەکیدا

- ئەو کەسانەی ئاستی زیرەکیان ١٨٠ بەرەوژورە: ئەم ئاستە تا ڕادەیەك سروشتی نییە ئەویش بە ڕێژەی یەك کەس لە ملیۆنێك کەسدا لەم ئاستەدا دەبێت، ئەم ئاستە وا لە خاوەنەکەی دەکات کە بگاتە بلیمەتی‌و داهێنانی زۆر گەورە، بەڵام لەوانەیە کەسان هەبن بگەنە ئەم ئاستە، بەڵام جۆش‌و حەماسی خۆڕاگریان کەم بێت.
- ئەو کەسانەی کە ئاستی زیرەکیان(١٨٠-١٦٥) ئەم ئاستەی زیرەکی نزیکە لە بلیمەتیەوە، ئەمانیش ژمارەیان کەمە لە کۆمەڵدا زیاتر حەزیان لە دورەپەرێزیە.
- ئەوانەی ئاستی زیرەکیان لە (١٦٥-١٣٠): ڕێژەی ئەم کەسانە لە کۆمەڵدا بە نزیکی (٣٪)یە، ئەمانە کەسانی دورە پەرێز نین لە کۆمەڵ.
- ئاستی زیرەکی (١٣٠-١١٠): ئەم ئاستە لە زیرەکی ڕێژەیەکی زۆری خەڵکە زیرەکەکان دەگرێتەوە.
- ئاستی زیرەکی (١١٠-٩٠): ئەمانە ئەو کەسانەن کە ئاستی زیرەکیان مام ناوەندیە.

o ئاستی زیرەکی لە ٩٠ کەمتر: ئەم کەسانەی لەم ئاستەدایە زیرەکیان لە خوار مام ناوەندیەوەیەو ژمارەشیان زۆرە لەوانەیە لە هەمو پۆلێکدا یەکێك لەو ئاستە بونی هەبێت.

| ڕیزبەندی | ڕێژەی زیرەکی |
|---|---|
| بلیمەت و داهێنەر | زۆرتر لە ١٤٠ |
| زۆر زیرەك | 110 - 140 |
| زیرەك | 110 - 120 |
| زیرەکی ئاسایی | 90 - 110 |
| زیرەکی ژێر مامناوەندەوە | 80 - 90 |
| لاوازی عەقڵی سادە | 70 - 80 |
| لاوازی عەقڵی مامناوەند | 50 - 70 |
| لاوازی عەقڵی زۆر | 25- 50 |

توانا: کۆمەڵە شێوازێکی ئەنجامدانی کارەکانە، کەزۆر بەیەکەوە پەیوەستن، لە کۆمەڵە شێوازێکی تر ناچێت‌و زۆر پەیوەندیان بەیەکەوە نییە.

ئامادەباشی: بریتیە لە باری هزری یان کۆمەڵە سیفەتێکی هزریی‌و جوڵەییە کە ئاماژەیە بۆ توانای کەسەکە بۆ ئەنجامدانی کارێکی هزری دیاریکراو.

مایکل دیل لە تەمەنی سی ساڵیدابوو بە بلیۆنێر لە ڕێگەی دامەزراندنی کۆمپانیای کۆمپیوتەر دروست کردنەوە، کە ڕێژەی فرۆشی کۆمپانیاکەی لە ماوەی کەمتر لە ساڵێکدا گەیشتە(١.٢)بیلۆن دۆلار. ئەو کەسێکی شارەزای بەڕێوبەرایەتی‌و ئەزمونی بەبازارکردنی هەبوو، ئەو ژیانی کردەیی زوو دەستپێکردو لەڕێگەی فرۆشتنی ڕاستەوخۆی کۆمپیوتەرەوە کاتێك خوێندکاربوە لە زانکۆی تەکساس، ئەو لەئەنجامی ئەزمونەکانی خۆی گەیشت

بەوە ئەنجامەی کە نوێنەری کۆمپانیاکانی وەکو (IBM) کەمتر زانیاریان هەیە لەسەر ئەو شتەی دەیفرۆشن لە کڕیارەکان، دیل کۆمپانیایەکی دامەزراند ئەو کەلوپەلانەی دەفرۆشت کە لە عەممارەکاندا دەمانەوە لە ڕێگەی پۆستەوە، لە دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی کە بەدەستیهێنا لە بازرگانیدا سەرابی ئەو ناوبانگەی کە هەیەتی تا ئێستاش کەسێکە ژیانی تایبەتی خۆی دەپارێزێت وهیچ نایەوێت قسە لەسەر ژیانی کەسی خۆی بکات، چونکە ئەو باوەڕی وایە کە ناوبانگ هەمو شتێك نییە.

ئەو پرسیارەی لێرەدا سەرهەڵدەدات ئەوەیە؛ بۆچی دیل بەو ماوە کەمە ئەو هەمو سەرکەوتنەی بەدەست هێنا؟ ئایا دۆخی بازار گونجاو بوو یان ئەو کەسێکی شانسداربوو؟ یان پەیوەندی بەشتێکی ترەوە هەیە کە تایبەتە بە دیل خۆی؟

بێگومان زۆر هۆکار هەیە تا دیل بگاتە ئەو ئاستە لەسەرکەوتن کەسێتی دیل کەسێتیەکی ناوێتەی چەند فاکتەرێکەو ناکرێت سەرکەوتنەکەی بۆ یەك هۆکار بگەڕێنینەوە. گەرچی دەتوانین بڵێین کە سەرکەوتنەکەی بۆ کەسێتی دیل دەگەڕێتەوە، کە بریتییە لە کۆمەڵە خەسڵەتو تایبەتمەندیەکی ناوازەو بێوێنە، کە ئەو پێ جیادەکرێتەوە، بە واتای ئەوەیە، کە کەسان هەن کۆمەڵە خەسڵەتێکی کەسێتی ناوازەیان هەیەو کەسانی ئاسایی نیین دەتوانن لە هەمو بارو دۆخێکدا سود وەربگرن بەئاراستەی سەرکەوتن بیانبات. دەتوانین ئەو خەسڵەتە جیاوازانە ناو بنێین جیاوازی تاکایەتی، ئەم جیاوازییە ڕۆڵی گەورەی لە هەمو لایەنەکانی ژیانماندا هەیە.

ئەوەی لە ئەزمونی خۆمانەوە بۆمان دەردەکەوێت لە تێکەڵاو بونمان لەگەڵ کەسانی تردا ئەوەی کە هەمو کەسێك ئارادەیەك بێوێنەیە وڕەفتارەکانیشی تا ڕادەیەك جێگیرە، هەمو تاکێك هەڵگری نمونەیەکی

ناوازەی تایبەتمەندیو خەسڵەتە، کە بەتەواوی لەکەسانی تردا نایبینیتەوە ئەوانیش وەکو (لایەنی جەستەیی، هزری، هەڵچونی، ویژدانیو بونیاتی دەرونی...هتد) سەرباری ئەمانە ئەم خەسڵەتانە تا ڕادەیەك جێگیرە بە تێپەربونی کات زۆر ناگۆڕێت، ئەگەر یەکێك بناسیت کە گەشبینو باوەڕی بەخۆی بێت، ئەگەرێکی زۆرە کە ئەو کەسە هەمان ئەم خەسڵەتانەی لە پێشوتردا هەبو بێت، و پێشبینی ئەوەش دەکەین کە لە ئایندەشدا ئەم خەسڵەتانەی تیایدا دەرکەوێتەوە. کەواتە ئەم دو پێوەرە (جێگیرییو ناوازەیی) بنەمای سەرەکی پێناسەی کەسێتیە، دەتوانین بڵێین کەسێتی نمونەیەکی جێگیرو ناوازەو ڕێژەیی ڕەفتارو بیرکردنەو هەستەکانە، کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات.

لێرەدا دەپرسین تا چەند کەسێتی بەرپرسە لە جیاوازی تاکایەتی لە ڕەفتاری کەسەکاندا؟

لە واتایەکی تردا ئایا ئێمە ڕەفتارێکی تایبەت لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا ئەنجام دەدەین بەهۆی کەسێتیمانەوە؟ یان بەهۆی هۆکارو فشارەکانی بارودۆخەکەوەیە یان بەهۆی هەردوکیانەوەیە؟

توێژینەوەکان وەڵامی ئەم پرسیارەیان داوەتەوە کە بەهۆی هەردو هۆکارەکەوەیە کە ڕەفتارێکی دیاریکراو ئەنجام دەدەین، بە شێوەیەکی تر ڕەفتارەکانمان لە هەڵوێستە جۆارو جۆرەکاندا بەهۆی کەسێتیمان هەلومەرجی ئەو هەڵوێستەوە دروست دەبێت، وای دانێ تۆ کەسێك دەناسیت کە بە سادەترین شت هەڵدەچێتو توڕە دەبێت، بیهێنە بەرچاوی خۆت ئەو کەسە پۆلیسی هاتوچۆ دەیوەستێنێت، چونکە خێرایی یاسایی تێپەڕاندووە لە هاژۆتنی ئوتومبێلەکەی، ئایا ئەو کەسە توڕەدەبێت کاتێك پۆلیسەکە دەیوەستێنێتو لێینزیك دەبێتەوە، نەخێر توڕە نابێت خۆی کۆنترۆڵ دەکات،

چونکە دەزانێت تورە بونەکەی لەبەرژەوەندی ئەو نییەو دۆخەکە خراپتر دەکات.

بەگشتی دەتوانین بڵێین ڕەفتارەکانمان لە ئەنجامی کارلێکی دولایەنەی خەسڵەتی کەسێتیو ژینگەی دەرەکیە هەردوکیشیان گرنگنو کاریگەریان هەیە. بەڵام پرسیاری دواتر ئەوەیە کە کامیان گرنگترە خەسڵەتی کەسێتی یان هەلومەرجی ژینگەیی؟

ڕاستیەکان ئەوە دەردەخەن کەسانێك هەن، کە خەسڵەتی کەسێتیان زاڵە بەسەر هەلومەرجی هەڵوێستەکاندا ئەو خەسڵەتانە دەتوانن هەلومەرجەکە بگۆڕنو چاکی بکەن، کەسانی تر هەن کە هەلومەرجی هەڵوێستەکە لایان زاڵترە بەسەر خەسڵەتی کەسێتیاندا. لێرەدا شتێك هەیە کە پێی دەڵێن (ئەندازیاری هەڵوێست) و (ئەندایاری تایپی کەسێتی) یەکەمیان مەبەست لێی ئەوەیە کە کەسەکە ئەندازیارە بۆ هەڵوێستەکەو دەیگونجێنێت لەگەڵ خەسڵەتەکانی کەسێتیدا، دوەمیان تایپی کەسێتیەکەی دەگونجێنێت لەگەڵ هەلومەرجی هەڵوێستەکەدا.

لەسەر ئاستی ڕەفتاری تاك لە ئیشەکەیدا، توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە، کە گونجاندنی پیشەیی بە مانای سازاندنی خەسڵەتی کەسێتی تاکە لەگەڵ تایبەتمەندی پیشەکەیدا، ئەمەش فاکتەرێکی هاوکارە بۆ خۆگونجاندنی دەرونی کەسەکە، بەمەش ڕەزامەندیو ئاستی کارکردنی تاك زیاتر دەبێت لە کارەکەیدا، تا چەند گونجاندن هەبێت لە نێوان خەسڵەتی کەسێتیو پێویستی پیشەکەیدا ئەوەندە ئەنجامەکان ئەرێنیو باش دەبێت. بەپێچەوانشەوە هەر ڕاستە.

## پێنج تایپە سەرەکیەکەی کەسێتی The big five model of personality

سالانێکی زۆر کار لەسەر دیاریکردنی خەسڵەتەکانی کەسێتی کراوە، یەکێك لەو هەوڵە سەرکەوتوانە ئەم تیۆرەیە، کە بە تیۆری پێنج تایپە سەرەکیەکەی کەسێتی ناو دەبرێت، ئەم تیۆرەو زۆرێك لە خەسڵەتەکانی کەسێتی لەناو پێنج تایپی سەرەکی کەسێتیدا کورت کردۆتەوە، کورتکراوە ئینگلیزیەکشی ئەمەیە(NEO-PI–R)، ئەو تایپانەش ئەمانەی لای خوارەوە:

یەکەم. زیندویی ویژدان: ئەم تایپەیان لەسەر هێڵێکی ڕاستە لە نێوان جدی بونو لێوەشاوەیی‌و بەرپرسیارێتی ڕێکوپێك و بە ئەدەبی‌و وردەکار لەگەڵ بێ سیستمی‌و نابەرپرسیاری، بێئەدەبی‌و هیچ لەبارانەبوون (الشیخ،٢٠١٢، لا ١٣١).

دووەم. داخراوی- کراوەیی: ئەمەش هێڵێکی بەیەك گەیشتووە لە نێوان کەسێتی کراوەو کۆمەڵایەتی‌و کەسێتی داخراو و دورە پەرێز.

سێهەم. قبوڵکردن. ئەم ڕەهەندە لە تایبەتمەندی هاوکارو چاوپۆش‌و نەرمێتی‌و هاوسۆزی‌و هیوا لەبەرامبەریشدا بەرگەنەگرتن‌و بێرەحمی، گوماناوی، نەبوونی دەستی هاوکاری، کەللەڕەقی، گێرەشێوێنی، دژبەرێتی‌و ناپەسەندی.

چوارەم. جێگیری سۆزداری. ئەم ڕەهەندە بە دڵەڕاوکێ‌و نشوستی‌و توڕەیی‌و ئاشوب‌و زوو وروژاندن دەست پێدەکات لەگەڵ ئارامی‌و جۆش خرۆش‌و هاوسەنگی‌و هەست بە ئاسایش کردن.

پێنجەم. ڕونی‌و ئاشکرایی کرانەوەیی؛ ئەم ڕەهەندە لەو خەسڵەتانەوە دەست پێدەکات وەکو ؛ خەیاڵ هەست، هزر، درککردن، بە ئەدەبی، داهێنەر، ئازاد لە بیرکردنەوەدا، لەگەڵ بێهەستی‌و بیرتەسکی‌و کەم عەقڵ‌و بێئەدەبی.

گرنگی ئەم ڕەهەندانە لەوەدایە کە ئەمانە بۆ کەسێتی بنەڕەتیو سەرەکین سەرباری جیاوازی کەلتوری.

## تایپی کەسێتی (A)و (B)

بە پێی تیۆری تایپەکان (جۆرەکان) توێژەرەکان بۆچونیان وایە، کە هەمو کەسێك خاوەن خەسڵەتێکی تاڕادەیەك جێگیرە لە مامەڵەکردنی بۆ هەڵوێستە فشاراویەکان، ئەوەش بەپێی کەسەکان دەگۆڕێتو کراوە بە سێ جۆرەوە (ئەو کەسێتیەی کە فشاری دەرونیەکەی مامناوەندە ئەوەش زۆرێك لە کەسەکان دەگرێتەوە، ئەو کەسێتیەی کە فشاری دەرونی بەرزە و پێ دەڵێن تایپی (A) ئەو کەسێتیەی کە فشاری دەرونی نزمەو پێی دەڵێن تایپی(B). تایپی




کەسێتی بە واتای ڕێکخستنێکی تەواوکارو ڕێکخستو لە سیفاتەکانی کەسێتی. بەیەکەوە بەستنەوەو ڕێکخستنی ئەم سیفاتە ناشکراو دیارانە لەکەسێتیەکدا دەتوانێت وەکو ئامرازی جیاکردنەوەی جۆری کەسێتیەکان بەکار بهێنرێت، کاتێکیش بەو تایپە کەسێك وەسف دەکرێت مانای وایە کە هەموو سیفەتەکان یان زۆربەی بە ئاستی جیاواز تیایدا ڕەنگبداتەوە.

فریدمان و رۆسمان(Friedman & Rosnman)لە ساڵی(١٩٧٤)دا ئەم دو توێژەرە گرێدانێکیان دروستکردوە لە نێوان تایپی کەسەکانو فشاری دەرونی، تایپی (A) بەوە وەسف دەکرێت کە کێبڕکێکارەو توندوتیژەو خێرا قسەدەکات وا هەستدەکات فشاری کاتی لەسەر بێت (هەمیشە وا هەست دەکات کاتی بەدەستەوە نییە بۆ تەواو کردن ئەو هەمو ئیشەی کە هەیەتی)، بە پێچەوانەی کەسێتی تایپی(B) کە هەست بە فشاری کات ناکات لەسەر خۆیو کێبڕکێکار نییە شێوازی ئاسان بۆ ڕوبەروبونەوەی فشارو کێشەکانی ژیانی ڕۆژانەی هەڵدەبژێرێت. ئەم دو توێژەرە لە توێژینەوەکەی خۆیاندا لەسەر کۆمەڵە کەسێك داوایان لێدەکردن دەقێك بخوێننەوە لەسەر شەڕو دواتر بۆیان باس بکەنو ڕۆڵی فەرماندەی شەڕەکە ببینن. ئەوەی لە ئەنجامدا بۆیان دەرکەوت کە تایپی کەسێتی (A) زۆر بە هەڵچونەوە قسەدەکەنو بە خێراییو زیاتر بەتوندوتیژیەوە بە پێچەوانەی تایپی (B)وە. تایپی کەسێتی (A) هەوڵی بەدەستهێنانی زۆردەدەنو چالاكو ڕیتمێکی خێرایان هەیە، حەزیان لەدەسەڵاتو تێکەڵاو بونە لەگەڵ خەڵکیدا، ئەم تایپە زۆر کۆنترۆڵی خۆیان ناکەنو هەمیشە کۆششی زۆر ئەنجام دەدەن. زۆر ئیش لەیەك کاتدا ئەنجام دەدەن، لە جۆری کەسێتیەکانی تر زیاتر توشی نەخۆشیەکانی دڵ دەبن. ئەمەش بە مانای ئەوە نییە ئەو ئیشانەی کە ئەم تایپە دەیکات باشترە لە تایپی(B)، ئەنجامی توێژینەوەکان دەریخستوە کە زۆرێك لەو کەسانەی لە ئاستێکی بەرزی بەرپرسیارێتیدا کاردەکەن لە تایپی(B)ین. چونکە تایپی(A) بێسەبرە و زیاترتوشی نەخۆشیە سایکۆسۆماتیەکان دەبنەوە لەبەر ئەوەش لاوازی بە بڕیارەکانیانەوە دیارە، زۆر دەکەونە هەڵچونەوە لەگەڵ کەسانی تردا وەمەترسی تەندروستیان زیاترە. ئەوەی گرنگە لەم کەسێتیەدا ئەوەیە کە نەرمێتیان هەیە بۆ گۆڕانکاری لەم سیفاتانەیاندا.

## تایپی کەسێتی خوڵقێنەری ژینگەکەی[10]

ئەگەر ڕەفتار ئەنجامی کارلێکی نێوان خەسڵەتی کەسێتیو فاکتەری ژینگەو هەڵوێستەکان بێت، ئایا کەسەکان بە جۆرێك ڕەفتار دەنوێنن کە هەڵوێستەکە لەسەریان دەسەپێنێت؟

بۆ نمونە ئەگەر کەسێك، کەسێکی دەم بەپێکەنینو قسە خۆشەو لە بۆنەو ئاهەنگەکاندا نوکتەی زۆر دەگێڕێتەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەمان ڕەفتار لەکاتی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنی بۆ دەستکەوتنی ئیش ئەنجام نادات.

لەو کاتەدا جۆری هەڵوێستەکە کاریگەری لەسەر تایبەتمەندی کەسێتیەکە وبژاردەی کردارەکانی هەیە، بە پێچەوانەی ئەمەشەوە دەبینین کە زۆرجار کەسەکان لەگەڵ هەڵوێستەکەدا کارلێك ناکەنو خۆبەدەست هەڵوێستەکەوە نادەن ئەوان هەنگاو دەنێن بۆ دروست کردنی هەڵوێستەکە وەکو ئەوەی بە پێویستی دەبینن، لەم ڕووەوە جیاوازی تاکایەتی ڕەهەندێکی گرنگی کەسێتیە، لەو کاتەی کەسەکان کارلێکی تەواو لەگەڵ هەلومەرجی هەڵوێستەکەدا دەکەن، هەوڵ دەدەن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ئەو دۆخە داسەپێنراوەدا. جۆرە کەسانێکی تر هەن کە ئاڕاستیەکی تر وەردەگرنو دەیانەوێت کاریگەری لەسەر ژینگەکەیان دروست بکەنو بیگۆڕن بەو شێوەیەی لەگەڵ بژاردەکانیاندا بگونجێت.

بەم ڕەهەندی کەسێتیە دەڵێن تایپی ئەو کەسانی ژینگەی خۆیان دروست دەکەن یان خوڵقێنەری ژینگەکەیان (Proactive Personality) ئەو کەسانەی ئاستی ئەم ڕەهەندە لایان بەرزە درك بەبوارە بەردەستەکان دەکەن لەسەر ئەو بنەمایەی وا مامەڵە دەکەن تا دەیگۆڕن، بە پێچەوانەی ئەوانەی

---

[10] Proactive Personality

ئەم ڕەهەندەیان نزمە ئەوانە سەرکەوتو نابن لە ناسینی بوارەکانی کە دێتە بەردەستیان کۆششێکی کەم دەکەن یان هەر نایکەن، ئەوان دۆخەکە وەکو خۆی پەسەند دەکەن پێیان وایە کە باشترین شت ئەمەی ئێستایە کە هەیە، توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستوە ئەو کەسانەی کە ئەم ڕەهەندەیان بەزرە لەسەر پێوەری پێنج تایپە سەرەکیەکەی کەسێتیش نمرەی بەرزیان وەرگرتوەو ئەمانە زیاتر لە ژیانی کەسیو پیشەیی خۆیاندا سەرکەوتونو بڕوایان وایە، کە هەموو شتێك دەشێت بکرێت، کەسانی دەوروبەریان قەناعەت پێدەکەن ئەو کارانە بکەن کە هەرگیز بەخەیاڵیشیاندا نەهاتووە کە بیکەن. ئەمان نەرمێتی زۆریان هەیە ئەگەر کارێکیان سەرکەوتو نەبوو شێوازەکەیان دەگۆڕن.

تایپی خۆ بەس بینین (خود کفایەتی)[11]. واتە تاکەکەس بڕوای بە توانای خۆی هەیە بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك. ئەو وێناگشتیەیە کە کەسەکان لەسەر تواناو لێهاتوەکانی خۆیان هەیانە، کە دەتوانن چەندین کار ڕاپەرێنن بە ئاستی جیاواز، ئەم لایەنەی کەسێتی بە گرنگ سەیر دەکرێت. دوو فاکتەری سەرەکی کاریگەری لەسەر ئەم لایەنە دروستدەکەن ئەوانیش:

١. ئەزمونی کەسی: ئەویش بریتیە لەو فیدباکەی (وەرگرتنی زانیاری لەسەر چۆنیەتی ئەنجامدانی کارەکە) کە پێشتر لەسەر ئەنجامدانی هەمان کار وەریگرتۆتەوە.

٢. ئەزمونی وەرگیراو:ئەو وێنایەیە کە لە لای دروستدەبێت لە ئەنجامدانی ئەو کارە لەلایەن کەسانی ترەوە، پشت بەو زانیاریانە دەبەستێت کە لەو سەرچاوانەوە وەریدەگرێت، بۆ ئەوەی لە کۆتایدا بگات بەو تواناو لێهاتوە پێویستانە بۆ سەرکەوتن لەو کارەدا.

---

[11] self-efficacy

٣. سەرباری ئەو شارەزایی‌و ئەزمونەی ڕاستەوخۆ لە ئەنجامی کردنی کارەکەوە دەستی دەکەوێت.

شێوازی بڕیاردانمان لەسەر تواناکانی خۆمان بە تێپەڕ بونی کات زووترو باشتر دەبێت. تا وای لێدێت دەبێتە پرۆسەیەکی ئۆتۆماتیکی، بە گەیشتن بەم قۆناغە ئیتر کاتێك بڕیاری ئەنجامدانی کارێك بدەین ئیدی مەحاڵە ئەو بڕیارە بگۆڕین، کاتێك درککردنی تاك بۆ بە توانایی یان بێتوانایی لە ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراودا دروستدەبێت، گۆڕانی زەحمەت دەبێت، ئەوەش ئەنجامی ناخۆشی لێدەکەوێتەوە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان بە تواناکانی خۆیان لاوازە. بەڵام خۆش بەختانە بە هەندێك ڕاهێنان‌و هاوکاری دەکرێت گۆڕانکاری لەو باوەڕەدا دروست بکرێت.

## کەسایەتی میکافیللی

(بەکارهێنانی کەسانی تر بۆ گەیشتن بە مەرامەکانت)

لە ساڵی(١٥١٣)دا فەیلەسوفی ئیتاڵی نیکۆل میکافیللی کتێبێکی بڵاوکردەوە بەناوی(میر) تیایدا هێڵی ستراتیجی گەیشتنی بەدەسەڵاتی سیاسی بەشێوەیەك توندو دڵڕەقانە داڕشتبوو. مەبەستەکەی لەو کتێبەدا ئەوەبوو کە دەتوانیت بگەیت بە دەسەڵات لە ڕێگەی هەڵخەڵەتاندن‌و بەکارهێنانی کەسانی ترەوە ئەگەر ئەم ڕێنماییانە پیادە بکەیت ئەوانیش:

- بە هیچ شێویەك دڵنزم‌و خاکی مەبە لەگەڵ کەسانی تردا، چونکە خۆ بەزل زانین کاریگەری زیاترە لە مامەڵەکردنی کەسەکاندا، کەسانی بالادەست بۆیان هەیە درۆ بکەن، باشترە خەڵك لێت بترسن وەك لەوەی خۆشیان بوێیت (مەبەست بەلگەی نامرازە).
- بە گشتی ئەو ئاماژەی بەوە کردوە ئەوانەی دەسەڵاتیان حەز لێیە کردەی پراکیتیکی‌و کرداری ئەنجام بدەن. ڕاستگۆیی‌و هاوڕێیەتی..هتد

بۆ کەسانی تر جێبهێڵن. چونکە خاوەن دەسەڵاتەکان دەتوانن هەمو شتێك بکەن تا بەردەوام بن لەو شتەی دەیانەوێت.

ئاشکرایە کە هەموو کەسەکان ئەم جۆرە فەلسەفەیەیان بەدڵ نییە، بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ دەبینین زۆرێك لەوانەی لە دەسەڵاتدان ئەم فەلسەفەیە زۆر بەووردی بەکاردەهێنن، ئەمەش وای لە توێژەرەکان کردوە کە ئەم جۆرە کەسێتیە وەك ڕەهەندێك لە ڕەهەندەکانی کەسێتی هەژمار بکەن.

چۆن بتوانین مامەڵەی ئەم کەسانە بکەین کە لە ئاستی بەرزی ڕەهەندی میکاڤیللیدان؟

بونی ئەم جۆرە کەسانە لە ژیانی گشتیو لە ناو کاردا شتێکی قورسە، ئەم کەسانە ئەو هەلۆێستانەیان لا خۆشە کە دەتوانن زۆرزانیەکەیان بەکاربهێنن لە هەڵخەڵەتاندندا ئەمانە بەهیچ شێوەیەك بەرژەوەندی کەسانی تریان بەلاوە گرنگ نییە.

هەروەها دەتوانن ببنە دوژمنێکی زۆر بەهێز. لەبەرئەوەی کە تۆ ناتوانی بەرەنگاری بیتەوە بۆیە زۆر ڕێگا هەیە کە دەتونیت خۆتیان لێبپارێزیت. بۆ ئەوەی نەکەونە هەلۆێستی لەو جۆرەوە هۆکارێك هەیە کە کەسایەتی ماکیافیللی درۆ و وەهەمو مناوەرات دەکات، چونکە زۆربەی جار ئەوانەی دەبنە قوربانی نایانەوێت باسی بکەن، قسە لەسەر ئەو بابەتە ناکەن، چونکە نایەنەوێت بڵێن کە هەڵخەڵەتێنراون ئەوە بۆیان ناخۆشە، ئەو جۆرە شاردنەوەیەش بە قازانجی ئەم کەسێتی ماکیاڤیللیە دەشکێتەوە. بۆیە گرنگە کە سەرنجی هەمو تاکەکانی کۆمەڵ ڕابکێشرێت بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لەم جۆرە کەسانە. ئەویش بەوەی ئەو جۆرە ڕەفتارانە ئاشکرا بکەنو باسی بکەن، بەئاشکراکردنی دەبێتە ئاگادار کردنەوە بۆ کەسانی تر کە چاودێریان دەکەنو ناتوانن وا بەئاسانی کەسانی تریش هەڵخەڵەتێنن.

گرنگیدان بە کردەی کەسەکان نەك بە گوتەکانیان. زۆرجار ماکیافیللیەکان وەستان لە هەڵخەڵەتاندنی کەسانی ترداو پێیان دەڵێن کە گرنگی بە بەرژەوەندیەکانیان دەدەن، شێوازی قەناعەت پێکردنیشیان هەیە هەمیشە داوەکەیەیان نامادەیە. بۆیە هەمیشە کۆبیرت لەسەر ئەو شتانە بێت کە کەسەکان دەیکەن نەك دەیلێن، ئەگەر مامەڵەکانیان نیشانە بوو بۆ هەڵخەڵەتاندنی کەسانی چواردەوریان ئەوا بەئاسانی پشتگوێیان بخە و هیچ جۆش‌و خرۆشیانت بەلاوە گرنگ نەبێت.

خۆت لەو هەڵوێستانە دور بخەرەوە کە ئەوان تیایدا سەرکەوتوو دەبن. وەك باوە ئەم کەسانەی ڕەهەندی ماکیافیللیان تیادا بەهێزە ئەو هەڵوێستانەیان لا زۆر باشە کە کەسەکان تیایدا دڵنیا نین کە چ بڕیارێك وەربگرن بۆ بەدەستهێنانی مەبەستێکیان، ئەم هەڵوێستانە زیاتر وا دەکات کەکەسان بکەونە داوی هەڵخەلەتاندنی مەکیافیللیەکانەوە. ئەگەر توانیت لەو هەڵوێستانەدا بڕیار وەرمەگرەو پەلەمەکە کاتێك لەگەڵ ئەم جۆرە کەسانەدایت.

## جیاوازی تاکایەتی لە پاڵنەرەکاندا

ئایا بیرت دەکەوێتە لە پۆلەکەتاندا چەند خوێندکاری سەرکەوتوی تیادا بوو، بیخەرەوە بیری خۆت ئەو کەسانە هەمیشە حەزیان لە کێبرکێ بوەو هەوڵی سەرکەوتنیان داوە لە هەموو تاقیکردنەوەکاندا بەتایبەت بابەتە قورس‌و گرانەکان. ئەی کەسی ترت بیردێتەوە ئەوانەی کە حەزیان لە دەسەلات بووە زیاتر لە دەرچون‌و یەکەمی، ئەی ئەو خوێندکارانەی کە حەزیان لەوە بووە کە ناوبانگیان هەبێت زۆر کەس بیان ناسێت‌و خۆشیان بوێت. بەکورتی ئەگەر ئەمانەت بیر بکەوێتەوە هەست بەجیاوازی پاڵنەری کەسەکان دەکەیت.

## پاڵنەری دەستکەوت (گەڕان بەدوای سەرکەوتندا)

هەندێجاریش پێ دەوترێت پێویستی دەستکەوت، کە ئاماژەیە بۆ ئەو ئارەزوە بەهێزەی کەسەکان هەیانە بۆ ئەنجامدانی کارو ئەرکە قورسەکان بەسەرکەوتویی‌و بەباشتر لە کەسانی تر. ئەو کەسانەی کە پاڵنەری دەستکەوتیان بەهێزە ئەوان زیاتر گرنگی بە ئەنجامدانی کارەکان دەدەن وەك لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بەدوای ئەو کارانەدا دەگەڕێن کە زەحمەتیەکی مامناوەندی هەبێت‌و جۆرێك لە ڕوبەڕوبونەوەی تیادا بێت. کارە ئاسانەکان ڕەتدەکەنەوە، چونکە سەرکەوتن تیایدا وەك دەستکەوتێکی ڕاستەقینە سەیر ناکەن، بەڵام ئەو کەسانەی کە پاڵنەری دەستکەوتیان نزمە ئەمانە ئەگەر کارەکە ئاسان بوو ئەوا سەرکەوتن تیایدا گەرەنتی کراوە، ئەگەر لە کارە زەحمەتەکانشیدا سەرکەوتوو نەبون ئەوە هۆکارەکەی دەگەڕیننەوە بۆ زەحمەتی کارەکە نەك بۆ خۆیان. ئەم کەسانەی پاڵنەری دەستکەوتیان بەهێزە بەدوای زانیاری زیاد لە پێویستدا دەگەڕێن لەسەر کارەکەیان، بەڵام ئەم کەسانە هەمیشە بەڕێوەبەرێکی باش نیین، چونکە زیاتر حەزیان لە مەرکەزیەتە لە دەسەڵاتدا، ئەگەرچی ئەم پاڵنەرە خاوەنەکەی بۆ سەرکەوتن هان دەدات، بەڵام نایکات بەبەڕێوەبەرێکی سەرکەوتوو.

## پاڵنەری دەسەڵات

پاڵنەری دەسەڵات لای کەسەکان جیاوازە، لەوانەیە ئەوانەی پاڵنەری دەسەڵاتیان بەهێزە ببنە ڕابەرێکی سەرکەوتوو، ئەم کەسانە بەدوای ئەوەوەن کە کاریگەریان لەسەر کەسانی چوار دەوریان هەبێت، مێشکیان ئارامە لەکاتی ڕوبەڕوبونەوەی کێشەو زەحمەتیەکاندا، لەبەرامبەردا کەسانێك هەن کە

پاڵنەری دەسەڵاتیان نزمە بگرە حەز دەکەن لایەنگری کەسانی تر بن زیاتر لەوەی کە دەسەڵاتدار بن، ئەم کەسانە بۆ ڕابەرایەتی شیاو نین‌و توانای دروستکردنی کاریگەریان نییە لەسەر کەسانی تر، بەڵکو خۆیان دەکەونە ژێر کاریگەری ڕابەرەکانەوە، ئەمان شیاون بۆ کاری جێبەجێکردنی فەرمانی کەسانی تر نەك خۆیان فەرماندار بن.

## کەسایەتی بەیانیان و کەسایەتی ئێواران

زۆر کارو پیشە هەیە بیست‌وچوار کاتژمێر بەردەوامە، سەرەڕای ئەوەی کارکردنی شەوانە بەخراپی کاریگەری لەسەر تەندروستی تاکەکان هەیە، وێرای ئەمەش کەسانێك هەن حەزیان لە کارکردنی ڕۆژەو بەیانیان چالاکن پڕ ووزەن، کەسانی تریش هەن کە حەزیان لەکاری شەوانەیەو بەشەو چالاکن کاردەکەن و بەیانیان خەواولوو بێهێزن. لە توێژینەوەیەکدا کە (ASH)ئەنجامیدا لەسەر خوێندکارانی زانکۆ داوای لێکردن خشتەیەك دروست بکەن بۆ کاتی خەوتن‌و کاتی خوێندنیان. ئەنجامەکان ئەوەی دەرخست، کە کەسەکان لەیەکتر جیاوازن، بۆیە خوێندکارەکانی کرد بە دو پۆلێنەوە: ئەوانەی حەزیان لە کاری بەیانیانە ئەوانەی حەزیان لەکاری ئێوارانە.

## جیاوازی تاکەکەن لە تواناکاندا

ئەو وتەیەی کە دەڵێت مرۆڤەکان بەیەکسانی لەدایك بون مانای ئەوە نییە کە هەمو مرۆڤەکان وەکو یەك بەتوانا بن بۆ ئەنجامدانی هەمو کار و پیشەیەك، بەڵکو ئەوە مانای ئەوەیە کە هەمومان هەمان مافمان هەیە وەکو ماف هەڵبژرادن، کەسێك نییە بتوانێت هەموو کارێك بکات‌و کەسێکی تر هەبێت نەتوانێت هیچ کارێك بکات. توێژەران تواناکانیان کردوە بەدوو

پۆلێنەوە؛ یەکەم توانای جەستەییەکان واتە ئەنجامدانی کاری جەستەیی‌و دووەم توانای درککردن واتە توانای کاری هزری.

**توانای درککردن:** هەندێك کار هەیە کە پێویستی بە بەکارهێنانی هزرو زانیاری زیاتر هەیە، چالاکی درککردنە گشتیەکان، هەندێك کاریش هەیە رۆتینەو پێویستی بە توانای هزری بەرز نییە، پێویست بە بیرکردنەوەی قوڵ ناکات. زۆر تێست هەیە تواناکان دەپێوێت وەکو تێستی زیرەکی(توانای بیرکردنەوەی رووت‌و فێربون لە ئەزمونەوە).

تا ئەم دواییە پێوانەکردنی توانای درککردن لە رێگەی کاغەزو قەڵەمەوە ئەنجام دەدرا، بەڵام ئەوەی توێژینەوەکان بەدەستیان خست ئەوەیە کە زیرەکی پەیوەندی بە چالاکی مێشکەوە هەیە ئەوانەی کە ئاستی زیرەکی بەرزیان تۆمارکردوە ئەوانەن کە ئاستی چالاکی لێدانی مێشکیان زیاتر بووە، ئەمەش ئەو شێوازەی داهێنا کە دەکرێت زیرەکی لە رێگەی بایلۆژیەوە بپێورێت بە شێوەیەکی راستەوخۆ، زیرەکی گرنگەو نیشانەیە بۆ هەبونی گەلێك لێهاتوویی درککردن وەکو:

هەست کردنی زوو: واتا توانای جیاکردنەوەی لێکچون‌و جیاوازیەکان لە وروژێنەرەکاندا بەخێرایی.

توانای ژمارەیی: توانای مامەڵەکردن لەگەڵ ژمارەدا بە وردی و بەخێرایی.

توانای خەیاڵکردنەوە: توانای وێناکردنی شتەکان لە مێشکدا بە وردەکارییەوە.

ئەو کەسانەی کە خاوەنی ئاستێکی بەرز یان نزمی ئەم توانایانەیان هەیە ئەوە شیاون بۆ هەندێك کار، توانای ژمارەیی بۆ کەسێك کاری ژمێریاری بکات پێویستە، زوو هەستکردن بۆ زانای زەرە پێویستە، تونای وێناکردن وخەیاڵ بۆ ئەندازیاری بیناسازی پێویستە.(السیسی، ٢٠١٠، لا ١٢٧-١٤٧).

# بەشی پێنجەم

- پێکهاتەی مێشك
- مێشك چۆن دروست دەبێت
- لە پیتاندنی هێلکەوە تا سێمانگی دوەم
- لەلەدایك بونەوە تا دوساڵی
- سەرەتای منداڵی
- قۆناغی سەرەتای هەرزەکاری تا تەمەنی بیست ساڵی بەرەوژور
- ئـەو تایبەتمەندیانـەی ئێمـە دەباتـەوە بـۆ نـاو سروشـتی مرۆڤایەتی
- ئەو سیفاتانەی کە تاکایەتیمان پێ دەبەخشێت

# پێکهاتەی مێشک

دەمارزانی بە بەراورد بە زانستەکانی تر هێشتا لەسەرەتای کاروانی گەشەکردندایە، سەد ساڵ زیاتر تێ دەپەڕێت بەسەر دەرکەوتنی ئەم زانستەدا، بەڵام ئەمە بەو مانایە نایەت، کە زاناو لێکۆڵەرەوان پێش دەرکەوتنی ئەم زانستە بیریان لەوە نەکردۆتەوە، کە مێشک چۆن کاردەکات؟ لە یۆنانی کۆندا کەڵەبیرمەندو فەیلەسوفەکان ئەندێشەی گەورەیان لەسەر ماهیەتو سەرچاوەی دروستبونی ئاگایی نوسیوە، بەڵام دەمارزانی (نیورۆلۆجی) کاتێك وەکو زانستێك دەرکەوت کەتوانرا بەهۆی تەکنەلۆجیاوە بزانرێت چ بەشێکی مێشك چالاك دەبێت لەکاتی ئەنجامدانی چ کارێکدا؟ .

لە ڕوی توێکاری چۆنیەتی کاری مێشکەوە پێشکەوتنی بەرچاو بەدیهاتووە، بەڵام هێشتا پرسیاری گرنگ هەیە پێویستە وەڵام بدرێنەوە لەو پرسیارانەش؛ ئایا کاتێك لەدایك دەبین مێشکمان تابلۆیەکی سپیو بەتاڵە یان نەخێر؟ وەڵامی ئەم پرسیارە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی ئەرستۆ، ئەو فەیلەسوفە یۆنانیە گەورەیە دەیوت مێشکی منداڵی ساوا وەکو تابلۆیەکی سپی وایە کە پێی دەوت (تابولا رازا) کە هێشتا هیچی لەسەر نەنوسرابێت، ئەو ڕای وا بوو، کە مێشکی منداڵی ساوا کاتی لەدایك بونی هیچ ئەزمونێکی لەسەر تۆمار نەکراوەو تابلۆیەکی سپیە، ئێمەی مرۆڤ کاروانی ژیانمان لەو کاتەوە دەست پێدەکەین کە لە دایك دەبین. ئەرستۆ وای دەبینی نوسین لەسەر ئەو تابلۆ سپیە کاتێك دەست پێدەکات کە ساوای مرۆڤ بەهۆی

هەستەکانیەوە مامەڵەی ژینگەکەی دەکات. ئەرستۆ دەیوت؛" هیچ شتێك لە مێشکدا نییە، مەگەر ئەوەی کە سەرەتا لە هەستەکاندا هەبێت"ئەم بیرۆکەیە بۆ ماوەی ۲۰۰۰ساڵ لەسەر شارستانی رۆژئاوا باڵادەست بوو.

دیاربوو کە ئەرستۆ کاتێکی ئەوتۆی بەسەرنجدانی منداڵی ساواوە بەسەر نەبردبو، منداڵی ساوا بە چەند ساتێك دوای لەدایکبونی سەری خۆی بۆ لای وروژێنەرە دەنگیەکان دەسورێنێت. خۆ ئەوان هێشتا جیهانیان نەبینیوە، باشە چی وا دەکات کە ئەوان بەو جۆرە رەفتاربکەن وەکو ئەوەی بیانەوێت شتێك ببینن. ئەو راستیەی کە ساوا توانای زۆری درککردنیان هەیە، ئەمە نیشانەیە بۆ ئەوەی کە فاکتەری بایلۆژی وجینی لە پێشتردا لەسەر دروستبونی جۆری بازنە دەماریەکانی ناو مێشك کاری خۆیان کردووە. بەواتایەکی تر مرۆڤ کاتێك لەدایك دەبێت بازنەی دەماری چالاکی هەیە ئەگەر روبەروی وروژێنەری گونجاو ببێتەوە دەبێت هۆی دەرکەوتنی رەفتاری تایبەت.

منداڵی ساوا دوای ماوەیەك کە لەدایك دەبێتو قسەکردنی دایکی دەبیستێت، ئەم وروژێنەرە (قسەکانی داکیەتی) وا دەکات کە بازنەی دەماری بەشی زمان لە مێشکیدا چالاك بێت، دواتر هەر ئەو شوێنە دەبێتە ناوچەی زمان لە مێشکماندا. کەواتە لە خاڵی دەست پێکردنی ژیانمانەوە مێشك تابلۆیەکی سپی نییە، سەرباری تایبەتمەندی جینی گشتی مرۆڤەکان، ئەوا تایبەتمەندی باوباپیرانیشمان لە دایكو باوکمانەوە بەمیراتی وەرگرتووە. هەبونمان تەنیا بەند نییە بە توانا جینیەکانمانەوە. لەوانەیە جینەکان لەپێشتردا مێشکی ئێمەی (بازنە دەماریەکانی نەخشاندبێت) پرۆگرام کردبێت، بەڵام کاتێك شتێکی نوێ وەردەگرینو فێردەبین، مێشکمان بەو وروژێنەرانەی ناو ژینگەکەمان کاریگەر دەبێت.

## مێشك چۆن دروست دەبێت؟ ئەم بابەتە چیمان فێردەكات؟

زیاتر لەنیوەی ئەو جینانەی كاریگەریان لەسەر جەستەی ئێمەی مرۆڤ هەیە، پەیوەستن بە دروستبونی ئەو كۆئەندامە ئاڵۆزەوە كە ناوی مێشكە. گەرچی دروستبونی مێشك قۆناغ بەقۆناغو بەشێوەیەكی دیارو ڕێكخستو گەشە ناكات. بەڵام دەتوانین خولی دیاریكراو دەستنیشان بكەین، كە تیایدا مێشك زۆر خێرایە لە گەشەكردنیدا.

ئەوە دەزانین كە پێش لەدایك بونی كۆرپەی ساوا، وزەی بۆماوەی جینەكانی منداڵ، سەرەكیترین ووزیە دروستبونی شێوەی مێشك. لە ڕویەكی ترەوە ئەوەش دەزانین كە ژینگەی ناوەكیو دەرەكی ژنێكی دوگیان كاریگەری زۆری هەیە لەسەر دروستبونی مێشكی منداڵی ساوا، بۆ نمونە، ئەگەر ژینگەی دایكە دوگیانەكە پڕبێت لەسترێسو ترس، ئەوا دەوری كاسەی سەری منداڵەكە كە لەسكی دایكیدایە بچوكتردەبێت، هەروەها ژمارەی بەندە سیناپسیەكانی فرونتاڵ (بەشی پێشەوەی مێشك) بەڕێژەیەكی مامناوەند كەمتردەبێت، لەوانەشە بەشی پێشەوەی مێشكی بچوكترو بەشی دواوەی مێشكی گەورەتر بێت. ئەوەش زۆر مەنتقیە، چونكە بەشی دواوەی مێشك پەیوەستە بە مانەوە بە زیندویی لە ژیاندا ئەو لایەنە ڕێكدەخات، بەشی پێشەوە بەرپرسە لە بیركردنەوەو هەڵهێنجانو خولقكاری. بەڵام ئەگەر هەلومەرجەكە لەكاتی سكپڕیدا ناسایی بێت. بەرنامەی جینی بنەڕەتی ترین فاكتەرە كە لەسەر گەشەی مێشكو پێكهاتەی دەماری پێش لەدایكبون كاریگەری هەیە. لە دوای لەدایكبون فاكتەری جینیو ژینگەكەی بەیەكەوە كارلێكدەكەن هەردوكیان كاریگەری لەسەر گەشەی مێشكی منداڵ دروستدەكەن.

## له پیتاندنی هێلکەوە تا سێمانگی دووەمی سکپڕی

چوار هەفتەی لە دوای پیتاندن، کۆرپەلەی مرۆڤ لەهەر چرکەیەدا ٨٠٠٠ خانەی دەماری دروست دەکات، واتە ئەو کۆرپەیە لە هەر خولەکێکدا لەمانگی یەکەمی ژیانیدا بەنزیکی نیو ملیۆن خانەی دەماری (نیرۆن) دروست دەکات. لە هەفتەکانی داهاتودا ئەو خانە دەماریانە خۆیان دەگەیەنن بە مێشك‌و لەوێدا لە شوێنێکی تایبەت جێی خۆیان دەگرن، لەگەڵ بەردەوامی دوگیانیەکە، دوو تەقینەوەی جیاواز لەیەك لە گەشەی مێشکی کۆرپەلەکەدا ڕودەدات: یەکەمین خولی تەقینەوەی گەشەی مێشك لە سێ مانگی دوەمی دوگیانیدا ڕودات (واتە مانگەکانی چوارەم، پێنجەم، شەشەم)تا سەرەتای سێ مانگی سێهەم بەردەوام دەبێت. لەم خولەدا مێشك لە هەر خولەکێکدا ٢٥٠ هەزار نیرۆن دروست دەکات.

لە کۆتایی سێ مانگی یەکەم‌و دەستپێکردنی سێمانگی دووەمدا، نورۆنەکانی کۆرپەلە لقوپۆپە دەندریدیەکان دروستدەکەن، ئەو دەندریدانەش بە نورۆنی هاوسێکەیەوە پەیوەندی سیناپسی دروست دەکەن‌و بەوەش بازنەی دەماری فراوانی بەیەکەوە گرێ دراو دروست دەبێت لەم خولەدا لە هەر چرکەیەکدا نزیکەی ٢ ملیۆن پابەندی سیناپسی دروست دەبێت. لەکەسێکی پێگەیشتودا لە ڕۆژێکدا نزیکەی ١٧٢ ملیارد پەیوەندی سیناپسی دروست دەبێت.

هەر لەو کاتەدا کە نیرۆنەکان بەیەکەوە پەیوەستدەبن بە خێرایی، مێشك خۆی ئەو ویست‌و بۆچونانەی کە باوباپیرانمان ئەزمونیان کردووەو سودیان لێ بینیوە هەڵدەگرێت. میراتی (جینی) منداڵی ساوا وەك ڕێنمایکارێکە بۆ دروستکردنی شێوازێکی سێ ڕەهەندی شانەی دەماری‌و دەرکەوتنی یەکەمین شێوەی نیرۆنی کاراو چالاك کە بەکاردەهێنرێت‌و کاردەکات. جۆری زیرەکی

ناوەکیو شێوە بە بونیادو پێکهاتەی مێشك دەبەخشن، ئەو ستراکچەرە کە کاری مێشکە، لە لایەن ناگاییو عەقڵەوە پشتیوانی لێدەکرێت، بە پێی دروستبونی ئەو هەموو پەیوەستە سیناپسیانە ناتوانین تیۆری تابلۆی سپی پەسەند بکەین، واتە مێشکی منداڵی ساوا تابلۆیەکی سپی نییە کاتێك لە دایك دەبێت.

سێ مانگی سێهەم (مانگەکانی حەوتەم، هەشتەم، نۆهەم) لەم سێ مانگەدا دوەم قۆناغی خێرای گەشەی مێشك دەست پێدەکاتو تا شەش مانگ یان ساڵێك دوای لەدایك بوون هەر بەردەوامی دەبێت. لەم قۆناغەدا ژمارەی خانە دەمارییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو زۆر زیاد دەبن. لەم سێ مانگەی سێهەمدا هەموو لایەنو پێکهاتەیەك کە لە مێشکی مرۆڤێکی پێگەیشتودا هەیە، مێشکی مرۆڤ لە تەواوی بونەوەرەکانی تر جیادەکاتەوە لە مێشکی ساوادا دروست دەبێت. لەم قۆناغەی تەقینەوەی گەشەی مێشکدا ئەو پەیوەندیو تۆڕە دەماریانەی دروست ببون زیاتر جێگیر دەبن، لە ڕاستیدا لەم کاتەدا ژمارەی خانە دەماریەکان (نیرۆن)و پەیوەندی سیناپسیەکان لە قۆناغی گەورەیی زیاترە، ئەوانە وەکو ماددەی خاون کە ئیتر بە درێژایی تەمەنی منداڵ دەتوانێت پرۆسەی فێربوونو گۆڕانکاری خودی خۆی بەو خانەنە دەست پێبکات. ژمارەو سەلامەتی ئەو پەیوەندیە سیناپسیانە لە ژمارەی هەموو خانە دەماریەکان گرنگترن، چونکە هەروەکو دەزانین کە ئەم کەڵەکەبونو ناڵۆزی پەیوەندییە دندرێتیەکان وا دەکات، کە زیرەکیەکی دەوڵەمەندتر، فێربونی کرداری، لێهاتوییە خێراکان، یادگایەکی هەمیشەیی بۆ مێشکی مرۆڤ بکاتە دیاری.

وا بیهێنە بەرچاوی خۆت، کە مێشکی منداڵێکی ساوا وەك کۆمپانیایەکی تازەیە. سەرەتا ژمارەیەکی زۆری لەکارمەندەکانی پسپۆر نینو کەسێك نییە

بەوان بڵێ بۆ کوێ بڕۆنو چی بکەن. بەڵام بە تێپەڕ بونی کات ئەو کارمەندانە پەیوەندی بە کارمەندانی ترەوە دروست دەکەن، ئەو پەیوەندیانە دەبێتە هۆکاری دروست بونی تۆڕێك لەپەیوەندی نێوان کۆمەڵە کارمەندێك کە بەیەکەوە کارێکی بەسود ئەنجام دەدەن. ئەو کاتە بەردەوامیو مانەوەی کۆمپانیاکە زیاتر لەوەی بە ژمارەی کارمەندانەوە وابەستە بێت بەسەلامەتی تۆڕی پەیوەندیەکانەوە وابەستە دەبێت. ئەو کارمەندانەی کە دەتوانن خێراتر ببنە ئەندامی ئەو تۆڕە پەیوەندیانە، دەتوانن لە کۆمپانیاکەدا بمێننەوە. دوای شەش مانگ کۆمپانیاکە چاوێك دەخشێنێتەوە بەو کارمەندانەی کە نەچونەتە ناو تۆڕی پەیوەندیەکانەوە، ئەوانە دەردەکات. لە هەمان کاتدا کارمەندی تازەش دادەمەزرێنێت ئەوانەشی پێویست نین دەریان دەکات.

بەتەواوی وەکو ئەم نمونەیەی باسمان کرد مێشکی منداڵی ساوا لە سێ مانگی سێهەمدا، زۆر شێوەی شانەی هەیە کە بەڕێکەوت دروست بووە، لەو کاتەی مێشك لە باری دروست بوندایە پێویستە باشتر ڕێکبخرێت تۆڕی دەماری هەیە کە ئەرکی تایبەتی لەسەر شانە، چەند هەفتەیەك لە دوای لەدایك بوون، ئەو نیرۆنانەی لە دروست بوندان بە شێوەیەکی جینی لەگەڵ نیرۆنەکانی دراوسێیدا دەکەوێتە کێبرکێوەو ئەویش تۆڕی دەماری دروستدەکات. ئەم تۆڕە دەماریانە چاویان پیادەخشێنرێتەوەو چاکسازی تیادا دەکرێت. تا ئەرکی تایبەتمەند بگرنە ئەستۆ. بابەتەکە سادەیە، ئەو دەستە نیرۆنانەی کە زووتر پەیوەندیان بەیەکەوە بەستووە لایەکی تایبەتی تۆڕی دەماری پێکدەهێن. ئەوان لەوانەیە بمێننەوەو شێوەی سیناپسی پێویست دروستبکەن، ئەمەش مانای ئەوەیە کە بەشێك لە نیرۆنەکان لەناو دەچن. کاتێك نیۆرۆنەکان دەبنە دەستە دەستەو ئەو شێوە گرنگانە دروست دەکەن.

ئەو نیرۆنانەی کە خێرایی تەواویان نییە، لەوانەیە بمرن. مانەوە بۆ شایستەترین نیرۆنە ئەم دیاریدەیە لە زانستی دەماریدا بە (داروینزمی دەماری) ناسراوە.

کەواتە ڕێکخستنی تۆڕە دەماریەکان لە قۆناغی دوگیانیەوە دەستپێدەکات، ژینگە کاریگەریەکی ئەوتۆی بەسەر ئەم پرۆسە خودکارەوە نییە. دەتوانین بڵێن کە ئەمە کارو فەرمانی جینەکانە لە ناوەوە کە شێوەیەك دەبەخشێت بە مێشك لە کاتی دروستبونیدا.

## لە لەدایك بونەوە تا دوساڵی

(٦٧٪)ئەو کالۆریەی کە منداڵی ساوا دوای لەدایکبون سەرفی دەکات بۆ گەشەی مێشکیەتی. ئەوە شتێکی مەنتقیە، چونکە گەشەی مێشکی منداڵ تا پێنج یان شەش مانگی دوای لەدایکبونیشی هەر بەردەوامە. خێرایی گەشەی ساوا ئەوەندە زۆرە بە دەگمەن ببینین کە منداڵێك لە شەش خولەك زیاتر بە وشیاری بمێنێتەوە. زۆرترین وزەی منداڵ دەکەویتە خزمەتی گەشەو گەورەبوونیەوە. لەو قۆناغەدا شێوەی سیناپسی جینی زۆر بەخێرایی دروست دەبن، بەبەردەوام بوونی داروینزمی دەماری، ئەو پەیوەندیە سیناپسیانەی کە پێویست نین دەسڕێننەوەو لادەبرێن.

لە دوای لەدایکبوونەوە دروستبونی پێکهاتەی مێشك تەنیا لە ژێر کاریگەری جینەکاندا نییە، بگرە وروژێنەرە ژینگەییەکانیش کاریگەریان دەبێت لەسەری. ساوا دەست دەکات بە وەرگرتنی ئەزمونو هەستەکانی، داتای پێویست لە ژینگەوە کۆدەکاتەوەو دوبارە بونەوەی وروژێنەرەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە پەیوەندی سیناپسی بەهێز دروست ببێت لە مێشکدا. منداڵی ساوا لەبەر ئەوەی نۆ مانگ لە سکی دایکیدا دەنگی دایکی بیستوە بۆیە بەتایبەت

ئەو دەنگە سەرنجی ڕادەکێشێت. بۆی ئاشنایە. کاتێك منداڵی ساوا بەشێوەی دوبارە وروژێنەرە هەستیەکانی وەك شتە بینراوو دەنگە بیستراوەکان بەیەکەوە هەست پێدەکات، ئەو کاتە ڕوخساری دایکی دەبەستێتەوە بە دەنگیەوە بەو شێوەیە کە منداڵی ساوا گرنگترین هۆکاری مانەوەی خۆی دەناسێتەوە.

ئەو پەیوەندییە سیناپسیانەی کە تازە دروست بوون و چالاکبوون. ئەو شتانەی ئەو لە ژینگەکەیدا ئەزمونی دەکات، لەناو خۆیدا جێگیری دەکات. لەم پرۆسەیەدایە کە نیرۆنەکانی مێشکی منداڵی ساوا شێوەی تایبەت پەیدا دەکاتو تۆڕی دەماری گرنگ دەسازێنێت، ئەم تۆڕانە ئەو توانایەی دەدەنێ تا زۆربەی کارەکانی خۆی ڕێکبخات، داتاو زانیاریەکان کۆبکاتەوەو کاتی پێویست بیگەڕێنێتەوە، داتاکان بەباشترین شێوە وەربگرێت. ئێمە ئەم پرۆسەیەمان ناو ناوە فێربوون. مێشك لە قۆناغی ساوایدا ئەوەندە بەخێرایی گەشەدەکات کە بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤ ئەو خێرایی گەشەکردنە بەخۆیەوە نابینێتەوە، ساوا هەر لەسەرەتاوە تەواوی ئەو دەنگانەی باوانی دەیبیستن ئەویش دەتوانێت بیبیستێت. بەڵام ئەو وشانەی کە بەردەوام لە دایکیەوە دەیبیستێت، ئەوە پایەی زمانی دایك لای منداڵەکە دروستدەکات. ئەگەر دایکی ساوایەك بە کوردی قسە بکات، بەڵام کەسانی چواردەوری منداڵەکە بە زمانی تر قسە بکەن، هەر زمانی دایك بۆ منداڵەکە زمانی کوردی دەبێت.

توێژینەوە زانستیەکان ئەوەیان دەرخستوە کە لەم قۆناغەدا وەڵامی دایكو باوك بۆ منداڵ زۆر گرنگە، لە یەکێك لە توێژینەوەکاندا بە گروپێك لە باوانیان وتووە کاتێك منداڵەکەتان گڕوگاڵ دەکات بەردەوام وەڵامی بدەنەوەو بەدەمیەوە پێبکەنن‌و هانی بدەن تا زیاتر گڕوگاڵ بکات. بە گروپی دوەمیان وتووە بەشێوەیەکی کەم‌و بەڕێکەوت بەدەم منداڵەکەوە پێبکەنن هەوڵ بدەن

که پێکەنینەکەتان وەك هاندان دەرنەکەوێتو نەبەسترێتەوە بە گرۆگاڵی منداڵەکەوە. ئەو منداڵانەی کە وەڵامی یەکسەرو بەردەوامیان لەباوانەوە هەبووە ئەوان توانای پەیوەندیان زۆر باشتر بووە لەو منداڵانەی کە هیچ وەڵامدانەوەیەکی ئەرێنی باوانیان نەدیوە. ئەم ئەنجامە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هاندانی بەردەوامو ڕاستەخۆی باوان ڕۆڵی گرنگی هەیە لە هاندانی منداڵەکە بۆ دروستکردنی دەنگی تازە، هەروەها هۆکارە تا ڕەگەزەکانی زمان باشتر لە مێشکیدا جێگیر بێت.

بەدرێژایی ئەم ماوەیە، بەهۆی پرۆسەی(هەرسکردن)وە مێشك ئەو شتانەی کە فێری دەبێت، دەیناسێتەوەو لە یادەوەریدا هەڵیدەگرێت، پەیوەندییە سیناپسیەکان هەرس‌و چاکسازی بۆ دەکرێت. ئەو سیناپسیانەی کە بەدەگمەن چالاك بون، توشی پوکاننەوە دەبن، وردە وردە لەناو دەچن. بۆ نمونە ئەو سیناپسیانەی کە پەیوەستن بەو دەنگانەوە کە ساواکە بەدەگمەن دەیبیستێت، لەناو دەچن، ئەو کەسانەی کە سەرپەرشتی منداڵی خوار دوساڵ لەئەستۆ دەگرن لە وڵاتانی تر، دەبینن کە ئەو منداڵانە زۆر بە زویی زمانی تازە فێردەبن‌و زمانی دایکی خۆیان بیردەچێتەوە، لەبەر ئەوەی لە ناو خێزانە تازەکەدا کەس بەو زمانە قسە ناکات.

منداڵی ساوا لەگەڵ دروست بونی مێشك‌و جەستەی، لە قۆناغی تەڤینەوەی تایبەتی گەشەکردنیدا سەربەخۆ لە کاریگەری ژینگەکەی گۆڕانکاری لە پێکهاتەی جەستەییدا ئەنجامدەدات، جینەکانی منداڵ ئەم پرۆسانە خۆبەخۆ لە کاروانی گەشەکردنیدا دەردەکەون. پرۆگرامی جینیەکانی مێشکی ساوا لە کاتی گەشەکردنی منداڵدا سیگناڵی (ئاماژە) کیمیاوی‌و هۆرمۆنی چالاك دەکەن کە هۆکاردەبن بۆ دروستبون‌و چالاکبونی تۆڕی دەماری تایبەت. ئەم تۆڕە نیرۆنیەی مێشکی منداڵ ئەو توانایەی لا

دروستدەکات کە تەواوی وروژێنەرەکانی ژینگەکەی وەربگرێت، کاتێك منداڵێك سەرنج لە ڕوخساری کەسێك دەدات، لەوانەیە لە شێوەی ڕەش‌و سپی‌و شێوەی نائاشکرا بەو لاوە هیچی تر نەبینێت. بەڵام کاتێك پرۆگرامە جینەکانی گەشەی بە پێکهاتەی مێشکی ئەو کرد، ئەوا لەڕێرەوی دەمارییەکانیدا چاکسازی کراوە و لەئەنجامدا درککردنی بینینی باشتر دەبێت بۆ وروژێنەرەکان.

بەشێوەیەکی سادە، پرۆسەی دروستبونی سروشتیمان هۆکارە بۆ ئەوەی ڕێڕەوە دەمارییەکانمان سەربەخۆ لە وروژێنەری ژینگەیی دروست ببێت. بە بەردەومی چاکسازی لە هەستەکان‌و گەشەکردنی مێشك لە ڕێگەی پرۆگرامی جینەکانەوە، لەوانەیە بتوانین بڕی زیاتر لە وروژێنەر ژینەییەکان وەربگرین. لەئەنجامیشدا شتی زیاتر لەسەر جیهانەکەمان فێرببین. کاتێك منداڵ هەنگاو بۆ نێو ئەم جیهانە دەنێت گەشەی ئەو لە ئەنجامی کارلێکی ئاڵۆز وتاڕادەیەك یەکسانی هەردوو فاکتەر جینی و ژینگە یان سروشت و پەروەردە دروست دەبێت.

## سەرەتای منداڵی

لە تەمەنی دوساڵیدا مێشکی منداڵ لەڕوی قەبارەو ژمارەی خانە دەمارییەکانەوە نزیك دەبێتەوە لە مێشکی کەسێکی پێگەیشتوو. زۆربەی نیرۆنەکان تا ساڵی دوەمی تەمەنی لە زیادبونی خۆیان بەردەوامن. لە هەندێك شوێنی مێشکدا وەکو مێشکۆکە، خانە دەمارییەکان هەر لە دابەشوبون و زۆربونی خۆیان ناوەستن، وادێتە بەرچاو کە توێکڵی مێشك لە تەمەنی دوساڵیدا زۆرترین ژمارەی سیناپسی هەبێت، لەم تەمەنەدا ڕێڕەوە دەمارییەکانی بەشی پێشەوەی مێشك (فرونتال) دەست بەدروست بون

دەکەن. دیارە کە بەرنامەی جینی مرۆڤ تا تەمەنی بیست و چەند ساڵی بەردەوام دەبێت لە دروستکردنی بەشی پێشەوەی مێشك(فرونتال)، ئێستا(پاکسازی) هەرسی سیناپسی کە پێش دوساڵی دەستی پێکردبوو، مێشك زیاتر دەگۆڕێت. ئەمجارە زۆرترین گۆڕانکاری لە ئەنجامی دوبارەبونەوەی ئەزمونەکان لەگەڵ کاریگەری بەرنامەی جینی دروست دەبێت.تا تەمەنی سێ ساڵی مێشکی منداڵ ١٠٠٠ تریلیۆن پەیوەندی سیناپسی دروست کردووە ئەم ژمارەیە دوهێندەی مێشکی کەسێکی پێگەیشتوە.

## قۆناغی سەرەتای هەرزەکاری تا بیستساڵیو بەرەو ژوور

لە کاتی باڵق بوندا، یەك تەقینەوەی تر لە گەشەی شانە دەماریەکاندا دەست پێدەکاتو مێشکیش هەوڵی خۆی دەدات پێ بەپێ ئەو خێرایی گەشەکردنەی لە هەمو لایەنێکی جەستەوە ڕودەدات، بەرەو پێشەوە بڕوات. ئەو گۆڕانکاریە کیمیاییو هۆرمۆنیانەی، کە سەربەخۆ لە ژینگە دروست دەبێت هۆکارە بۆ دەرکەوتنی گۆڕانکاری لە (هەیکەلی) ستراکچەری مێشکدا. بۆ نمونە لە کاتی باڵقبوندا، خانە دەماریەکانی پەیوەست بە سەنتەری هەستەکانی مێشکی ناوەڕاستەوە (بەتایبەت ئەمیگدال) دروست دەبێت لەگەڵیشدا چالاك دەبێت. ئەم قۆناغی گۆڕانکاریە لە کوڕاندا لە دوانزەساڵیداو لە کچاندا لە یانزە ساڵیدایە. قەبارەی توێکڵی مێشك گەورە دەبێت، بەهەمان شێوە لەتەمەن یانزە ساڵیدا، مێشك جارێکی تر ئەو ڕێرەوە دەماریانەی بەکار ناهێنرێت ئەمجارەیان خێراتر لەناویان دەبات.

دوای ئەوەی ئەم تەقینەوە گەورەیەی لەگەشەی تاکەکەسدا ڕودەدات، پرۆسەی پاکسازی لە پەیوەندی دەماریەکاندا تا تەمەنی بیستو چەند ساڵی

بەردەوام دەبێت. پێویستە ئەوەمان لەبەرچاو بێت کە هەرجارێك مێشك گۆڕانکاری بەسەردا دێت، ئەو کاتە وشیاریو بەئاگایی، واتا توانای فێربوون، یادگاو خۆ دروستکردن زیاتر دەبن، بە هەمان هۆکار لەم قۆناغەی دروستبونی مێشکدا، زۆربەی هەرزەکاران زۆر بەتوندی بۆ شوناسو باوەڕیەکانیان دەجەنگنو لەسەریان سوردەبن.

یەکەمین بەشی مێشك کە پێکهاتەو گەشەیان تەواو دەبێت توێکلی هەستیو جولەییە، واتا ئەو بەشانەی کە پەیوەستن بە بینین، بیستن، دەستلێدانو جولەکردن. دواتریش بەشی پارانتاڵ (The parietal lobe) پێکهاتەی خۆی تەواو دەکاتو هەندێك شێوەی کۆتایی زمان ناسین، شوێن ناسین تیادا دروست دەبێت. دوا بەش کە گەشەی تەواو دەبێت بەشی فرۆنتاڵە، واتە ئەو بەشەیە کە لە تەواوی کارە کرداریەکانمان بەرپرسە وەك ؛ تەرکیزکردن، بەئاگایی، پلان دانان بۆ ئاییندە، ڕێکخستنی ڕەفتار، ئەم بەشەی مێشك زیاتر نەرمێتی تیادایە دەتوانێت لەهەمو بەشەکانی تری مێشك زیاتر پەیوەندی دەماری تازە دروستبکاتو پەیوەندیە کۆنەکان لەناو بەرێت، ئێمە لە گۆڕانکاری کردنی خودی خۆمان لەم تایبەتمەندیە سود وەردەگرین.

تەواو کامڵ بونی بەشی فرۆنتاڵ دوا ئاستی گەشەسەندنە، کە لە بیستو چەند ساڵیدا مێشك بۆ گەیشتن بە تەواوی گەشەی خۆی پێویستی پێیەتی. ئەم قۆناغی پسپۆڕی وەرگرتنەی مێشك دەمانباتە ناو قۆناغی پێگەیشتوییەوە، ئەوپەری بەهێزی غەریزەی سێکسیو بەهێزبونی هەستەکانمانو ڕەفتای هەڵەشەیی (adult fixation)و زیاد بونی ئاستی ووزە لەم قۆناغەدا ئەزمون دەکەین، بەلام وەك باوە تا بیستو چەند ساڵیو هەتا دورتریش ناتوانین کۆنترۆڵی ئەم لایەنانە بەدەست بهێنین، چونکە

کۆنترۆڵو سنوردانان بۆ هەڵەشەیەکان بەرپرسیارێتی بەشی پێشی پێشەوەی مێشکە(فرۆنتاڵ)، بە شێوەیەکی سادەتر ئێمە لە بیست و پێنج ساڵیەوە تا سی ساڵی دەتوانین باشترو ڕونتر لەساڵانی پیشوتر بیربکەینەوە(جو دیسبونزا، ۲۰۲۱،ل۲۱۰)

پێشکەوتنی مێشك لێرەدا ناوەستێت. تا ماوەیەك لەمەوبەر زاناکان وای بۆ دەچون کە گەشەی مێشك لە قۆناغی تەمەنی بیستو چەند ساڵیەدا دەوەستێت ئەمە بە دواقۆناغی گەشەسەندنی مێشکیان دەزانی. بەڵام ڕاستیەکە ئەوەیە کە مێشکمان ئەوەندە ڕەقو رایەڵە نەکراوە، مێشکی مرۆڤ نەرمێتی(neuroplasticity)و توانای خۆسازاندنی زۆر بەرزی تیادایە. واتە ئێمە دەتوانین لە ڕێگەی فێربونی بەردەوامەوە، ئەزمونی تازەوە چاکسازی لە ڕەفتارەکانماندا بەدرێژایی تەمەن ئەنجام بدەین. شێوەی مێشك بگۆڕین.

لێرەدا نۆرەی ئەوەیە کە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە: **مێشکی من لەگەڵ مێشکی کەسانی تردا لە چیدا هاوبەشە؟ لە حاڵێکدا کە مێشکم میراتی جینەکانی دایكو باوکم دەردەخات، ئەی چۆن بتوانم تاکایەتی خۆم بپارێزم وەکو خۆم بمێنمەوە؟**

## ئەو تایبە تمەندیانەی کە ئێمە دەباتەوە بۆ ناو سروشتی مرۆڤایەتی

ئەندامی هەریەك جۆر لە بونەوەران، بەهۆی باری کیمیاییو بونیادی ئەناتۆمیکیان هاوشێوەی سیستمەکانی مێشکیانە، تایبەتمەندی جەستەیی، ڕەفتاری عەقڵی وەکو یەکیان هەیە. بۆ نمونە پشیلە ئیتر پشیلەی ماڵی بێت یان کێوی، هەمویان سیفەتی بنەڕەتیو تایبەتیان هەیە، ئەم ڕاستیە بۆ جۆری خۆشمان وەکو هۆمۆ ساپینسو ساپینس هەر ڕاستە. هەمو مرۆڤە

ئاساییەکان دوقاچیان هەیە بەرێکی دەڕۆن، پەنجە گەورەیان تونای جوڵەیەکی زۆری هەیە. زۆرێك لە گیاندارەکان جیهان بەرەش‌و سپی دەبینن. بەڵام ئێمە جیهان ڕەنگاو ڕەنگ دەبینین. چونکە هەمومان توانای دەماری یەکسانمان هەیە لەڕوی وەرگرتنی وروژێنەری بینینەوە. هەمومان وەك یەك خواردن دەخۆین‌و هەرسی دەکەین. خولی خەوتنی هاوشێوەمان هەیە، بە زمانی قسەکردن پەیوەندی بەیەکەوە دەکەین، هەمومان ئەزمونی هەستەکانمان هەیە، لەکاتی هەراسانی‌و ترس‌و خۆشحاڵیدا هەمان سیماو ئاماژەی ڕوخسارمان هەیە. ئێمە بەو ناوەی کە ئەندامی جۆری مرۆڤین، توانای هەڵهێنجان‌و ئیستدلالی ئاڵۆز بە میراتی وەردەگرین، هەمومان سیفاتی جەستەیی‌و ڕەفتاری‌و زهنی هاوشێوە نیشان دەدەین کە لە جۆرەکەماندا هەیە. سروشت لەو ڕێگەیەوە ئەو توانایەمان دەداتێ وەکو مرۆڤ باڵادەستی هاوبەشمان هەبێت، ئەم سیفاتانەو هەندێك سیفاتی تر، ئەمانە سیفاتی جینی دریژ ماوەی ئێمەن. بەئاماژەیەکی تر، بونیاد (ستراکچەر)و کردار لە هەمو جۆرەکاندا بەیەکەوە پەیوەستن.

ئەو سیفەتانەی درێژماوەن‌و لە بۆماوەی مرۆڤەوە دروست بووە، هۆکارە بۆ ئەوەی تەواوی تاکەکانی کە تەندروست‌و ئاساین بە سیستمی کیمیایی‌و کرداری مێشکێکی یەکسان لەدایك ببن. ئەم بابەتە دیسانەوە دوپاتکردنەوەی ئەو چەمکەیە کە دەڵێت ستراکچەرو کردار هاوشێوەی یەکترن. لێرەوە کە هەمومان ستراکچەری مێشکمان یەکسانە. لە ئەنجامدا کرداری هەموشمان هەر یەکسان دەبێت. لەوە وە کە جەستەی هەمومان بونیادی گشتی یەکسانی هەیە، پاشان جەستەی مرۆڤ بەدرێژایی ئەزمونە جۆراو جۆرەکان کە لەگەڵ گەشەکردنی جۆری مرۆڤ لە ژینگەوە بەدەستی هێناوە. بەوەش ستراکچەی گشتی مێشکی دروست کردوە. لەوەشەوە کە ئێمە ئەندامی هەستی هاوبەشمان

هەیە(چاو، گوێ، لوت، دەم، پێست). ئەم دەرگای هەستانە یەکسانن بۆ نمونە ئازارو چێژ وەکو یەك هەستی پێ دەکەین (ئێمە هەمومان ئاگر بە گەرم دەزانین)، بە بەکارهێنانی ئەندامی یەکسانو توانای جوڵەیی ئیرادی هاوشێوەوە لەگەڵ ژینگەکەماندا مامەڵە دەکەین، هەمومان وەکو یەکتر دار بەدەستەوە دەگرین، چونکە پەنجە گەورەمان بەرامبەر پەنجەکانی ترمانە، بەتەواوی مەنتقیە ئەزمونی جەستە بەپێی قۆناغە جیاوازەکان شێوەو دارشتنی مێشك لە ئاستی ماکرۆسکۆبیو میکروسکۆبی دیاریکردووە. هەمو مرۆڤەکان نەخشەی جەستەیی هەستیو زهنی بنەرەتی یەکسانیان بە بۆماوە وەرگرتوە هەر ئەمانەشە ئێمەی کردوە بە مرۆڤ.



## ئێمە چۆن نەخشەی مرۆڤایەتیمان وەرگرتوە؟

مێشك لە ڕاستیدا یادگای ڕابردووە لە ئەنجامی خۆگونجاندنی جۆری مرۆڤ لەگەڵ ژینگەکەی بە ملیۆنان ساڵ شێوەی وەرگرتوە، هەر یەك لەو سێ مێشکەمان گروپێکی تایبەتی لە سیفەتە جینیە درێژماوەکانی بە دیاری پێداوین کە لە ئەنجامی وەلامی فشارەکانی ژینگەوە دروست بووە. بۆ نمونە سیستمی نائیرادیو پەرچەکرداری (لێبخە و راکە) لە سیستمی مێشکی تەواوی شیردەرەکانو مرۆڤدا هەیە، کە ئامانج لێی مانەوەی مرۆڤە بە زیندویی، ستراکچەر و کرداریشی وەکو هەمو شیردەرەکانی تر وایە، ئەم سیستمی پەرچەکردارە وەکو یەك سیفەتی جینی درێژ ماوە لای شیردەرەکان گەشەی کردوە. چونکە ئەم سیفەتە بەدرێژایی نەوەکان بۆتە هۆی زیادبونی توانای مانەوەی ئەم جۆرانە بەرامبەر مەترسیو هەڕەشەی ڕاوچیەکان.

لەگەڵ بەردەوامی گەشەی جۆری مرۆڤ، تویکڵی مێشك تەواوی ئەزمونەکانمانی لە چوارچێوەی ڕوداوەکاندا لە سنوری دەماری خۆیدا هێمابەندی کردوە جێگیری کردوە. ئێمە وتمان لە مێشکدا نیرۆنەکان بونیان هەیە، کە تایبەتن بە توانای بەکارهێنانی زمانی قسەکردنەوە. ئەم سیفەتە جینیە درێژماوەیە، لە نێو هەمو مرۆڤەکاندا هاوبەشە. هەمو ئەو شتانەی کە فێری بوینو سودی هەبوە بۆ زیندو مانەوەو زۆر بونی جۆری مرۆڤ، لە شێوە پێدان و پێکهاتە و کارکردی مێشکی ئەمرۆماندا بەشدارن، هەمو مرۆڤەکان یادەوەری جینی درێژ ماوەی بە میراتی بۆ ماوەتەوە کە لەناو سیستمی دەماریدا هێماگوزاری بۆ کراوە، ئەم یادەوەرەی جینیە وەکو

سەکۆیەکە بۆ فێربونمان. ئێمەی مرۆڤی ئەم سەردەمە لەو سەکۆیانە سود وەردەگرین.

لە توێژینەوەیەکدا کە دکتۆر جو سینوزا لەسەر سیفاتە جینیە درێژماوەکان ئەنجامیداوە، لەسەر بونیادو تایبەتمەندیەك تەرکیزی کرد کە هەمو مرۆڤەکان هەیانە، بۆ نمونە لەبەرئەوەی هەمو مرۆڤەکان دەستیان هەیە، ئەزمون و توانای تایبەتیان هەیە کە هەمومان لەو توانایەمان هەیە. ئەگەر دەست وەکو سیمبولی سیفاتی جینی درێژماوە بزانین کە ئەندامبونمان لە یەکجۆردا (مرۆڤ)بەئێمەی بەخشیوە. ئەو کاتە کاریگەری پەنجەمان هێمایە بۆ تایبەتمەندی جینی کورت ماوە کە یەکتایی و بێوێنەیمان پێ دەبەخشێت.(جو دیسبونزا، ٢٠٢١،لا٢١٥)

## ئەو سیفاتانەی کە تاکایەتیمان ( فەردانیەتت ) پێ دەبەخشێت

ئێمە وتمان کە ژینگەو جینەکان شێوەمان پێدەدەن وەکو مرۆڤ، لەو ڕوانگەیەوە کە تەواوی مرۆڤەکان ستراکچەری مێشکیان یەکسانەو تایبەتمەندی جەستەیی‌و ڕەفتاری‌و زهنی بنەڕەتیان (کە هەمان سیفاتی جینی درێژماوەن) هاوشێوەن. **بەڵام ئەوە چ شتێکە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ هەر لەسەرەتای ژیانیەوە بە شێوەیەکی جیاواز لەوانی تر ڕەفتار بکاتو بیربکاتەوە؟**

ئەوە(تۆ)چۆن دروست بویت؟ بۆچی تایبەتمەندی کەسێك وا دەخوازێت زۆر بڕواتە دەرەوەو توندوتیژ بێت، بەڵام کەسێکی تر شەرمن‌و دودڵە؟ بۆچی هەندێك کەس لێهاتویی زمانیان زۆر باشە، کەسانی تر لە بیرکاریدا زیرەك‌و لێهاتون، هەندێکی تر لێهاتویی وەرزشیان هەیە؟ بۆچی درکمان بۆ جیهان، باوەڕەکانمان، ئەو بابەتانەی حەزمان لێیەتی، ئامانج‌و خواستەکانمان

باری سۆزداریو پەرچەکردارمان بۆستریس لەیەکتر جیاوازە؟ **ئەوە کام هۆکارەیە کە جیاوازی تاکایەتی یان سیفاتی جینی کورت ماوە لەیەك جۆردا دروست دەکات؟**

ئەگەر واز لە ئەزمونی تاکەکەسیو ژینگە بهێنین، دەتوانین بڵێین کە ئەم جیاوازیانە تا سنورێك بەو پاساوە دروست دەبن بۆ ئەوەی کەسێك لەدایك بێت پێویستە ژنو پیاوێك ئاوێتەی جینی (DNA) خۆیان تێکەڵ بکەن، ئەم ئاوێتەی جینیە هۆکاری دروست بونی کەسێکە کە سیفاتی جینی کورت ماوەی لە ڕێگەی باوانیەوە بە میراتی وەردەگرێت، ئێمە لە کۆتاییدا لەدایكو باوکی خۆمان دەچین.

لە ڕاستیدا ئێمە بە هیچ شێوەیەك لەسەدا سەد هاوشێوەی هیچ کامێك لە دایكو باوکی خۆمان نابین، چونکە هەریەکێك لە ئێمە ئاوێتەیەکی بێوێنەی جینی باوانی خۆی بە میراتی بەرکەوتووە لەم بارەشدا بە ئەگەرێکی زۆرەوە تایبەتمەندی باپیری باپیرانمان یان هەتا دورتریشمان وەرگرتبێت، لەبەر ئەوەیە ئاماژەی جینە کورت ماوەکان وا دەکات هەریەکەمان ناوازەو بێوێنە بین، ئەگەر سەرنج بدەینە ئاڵۆزی گۆڕاوی جینەکان، ئەگەری ئەوەی کە ژنو مێردێك بتوانن کۆپی یەکێك لە منداڵەکانیان دروست بکەنەوە (لەدەرەوەی ئەو دوانانەی کەلەیەك هێلکەوە دروست بوون) مەحاڵە واتە بەنزیکی سفرە.

ئەگەر بەسادەتر ئەمانە ڕونبکەینەوە ئەوە دەڵێین: ئێمە جینی تایبەت لەهەریەك لە باوانی خۆمان بەمیراتی وەردەگرین، جینەکان لەناو خانەکانی جەستەماندا پرۆتین بەرهەم دەهێنن، خانەکانی ئێسك پرۆتینی ئێسك بەرهەم دەهێنن، خانەکانی جگەر پرۆتینی جگەر بەرهەم دەهێنێت، تەواوی ماسولکەکان، ئەندامەکانی ناوەوە، شانەو ئێسکەکانو ددانەکان ئەندامی هەستەکان، خانەکانی خۆیان لەسەر بنەمای ڕێکخستنی داتای جینەکان زۆر

دەبن، کە ئێمە لەڕێگەی بۆماوەوە لە باوانمان وەرمانگرتوە، بۆ نمونە دەزانین کە سیفاتی دیاری جەستەیی وەکو ڕەنگی قژ، بالآو بونیادی ئیسقان لە باوانەوە بۆ منداڵەکانی دەگوێزرێنەوە، ئەوەندە بەسە کە بزانیت کۆمەڵە گۆڕاوێکی ئالۆز ئەوە دیاریدەکەن کە کام سیفات وەکو میراتی بگوێزرێتەوە بۆ تۆ لە جەستەتدا دەربکەوێت.

بەڵام دەرکەوتنی تایبەتمەندیەکان تەنیا بە لەیکچونی ڕوخسارمان لە باوان سنوردار نییە، بەڵکو شێوەی وردی خانە دەماریەکانیش دەگرێتەوە، شێوازی مێشکی هەر مرۆڤێك لەسەر بنەمای پرۆگرامی جینی دیاریدەکرێت کە لە نزیکترین باوباپیرانی خۆمان بە میراتی وەرمان گرتووە. هەر یەکە لە باوك‌و دایکمان ئەزمونی خودی خۆیان هەبووە، سیفاتی کەسێتی، لێهاتویی تایبەت، فێربوون، هەستی تایبەتیان لا پەسەند بووە، ئەم زانیاری‌و داتایانە لە شێوەی قاڵبی پەیوەندییە سیناپسیەکانەوە یان لە شێوەی تۆڕە دەماریەکاندا پارێزراوە. وا دەردەکەوێت کە باوانمان بەشێك لە ئاکارو ویستەکانی خۆیان لە قاڵبی هێمای جینی کورت ماوەدا بۆمان گواستۆتەوە.

لەڕاستیدا لەوانەیە ئامادەباشی‌و بۆچونی سۆزداری کە باوانمان لە خۆیاندا دروستیان کردوە، بەگشتی لەڕێگەی بۆماوەوە بۆمان بگوێزرێتەوە. بۆ نمونە، دایکتان ئەو هەستەی لا هەبووە کە خۆی بەقوربانی ببینێت، ئەگەر بەردەوام بیری لە ئازارو ئێشی جەستەیی‌و زهنی کردبێتەوەو ئەو بیرۆکانەی هێنابێتەوە یادی خۆی، بەردەوام بۆڵەی هاتبێت‌و هۆکاری کەموکورتیەکانی خستبێتە ئەستۆی کەسانی تر، و لەپاساو هێناوەدا لێهاتوو بوو بێت، بەو شێوەیە بە ئەگەرێکی زۆرەوە تۆڕی سیناپسی ئەو بە دوبارەترین بیرۆکەکانی کە لەسەریدا هیلانەیان کردوە، هاوشێوە بووە، بیرکردنەوە دوبارەکانی‌و هەستی بەردەوامی کە ئەو قوربانیە، هۆکار بوە بۆ بەهێزبونی بەرنامەی

نیروکیماوی(کیمیای مێشك). ئێستا دەتوانین تەخمین بکەین کە تۆڕی دەماری قوربانی بونی دایکتان لە کەسێتی تۆ یان خوشك یان برایەکتان کاریگەری دروست کردووە، هەمان شت لەبارەی بابەتە ئەرێنیەکانەوە هەر ڕاستە. بۆ نمونە ئەگەر کەسێك ئارەزوی مۆسیقی هەبێت، تۆڕی دەماری ئەو هۆکارە بۆ ئەوەی منداڵەکانیشی بەشێوەیەکی سروشتی حەزیان لە موسیقا بێت حەزبکەن فێری ژەنینی ئامێرێکی مویوزیك ببن. ڕاهێنانو کاری کرداریو وێناکردنی زهنی لەپاڵ بیرکردنەوەی دوبارەو ئەزمونی چەند بارە شێوە بە مێشك دەبەخشێت لەسەر ئاستی میکرۆسکۆبی. هەتا ئەو زانیاریە پشت ڕاست کراوەتەوە، کە بەشێك لە نیوەگۆی لای چەپی مێشك بەناوی تێمپوراڵەوە[12] لە مۆسیقازانەکاندا گەورەترە وەك لە کەسانی تر. دەستەیەك لە نیرۆنەکان بەیەکەوە وابەستە دەبنو تۆڕێکی دەماری دروستدەکەنو شێوازی بیرکردنەوەو ڕەفتارو هەستو پەرچەکردارمان دیاریدەکەن. ئێمە لە باوانی خۆمان هەردوکیان ئەو جینانە بەمیراتی وەردەگرین کە ڕابەرایەتی دروستبونی خانەی دەماری تایبەت دەکەن لە مێشکماندا، کاتێك ئەو خانە دەماریانە دەست بەکارو بەرنامەکەنیان دەکەن، پرۆتینی تایبەت بەرهەم دێنن کە ستراکچەری نیرۆنەکان دەستنیشان دەکەن.

پێش ئەوەی ئێمە بێینە دنیاوە، ئەو جینانە فەرمانی خۆیان بۆ خانە دەماریەکان دەرکردووەو شێوەی سەرەتایی پەیوەندیەکانیان دیاریکردووە. مێشکی کۆرپەلە لەشەش مانگیدا(لەسکی دایکیدا) فەرمانی جینەکانی باوانی جێبەجێکردووە بۆ دروست کردنی پێش وەختەی شێوەی پەیوەندی سیناپسیەکانی. نیرۆنەکانی مێشك لەم پرۆسەیەدا ڕێکخستنێکی تایبەت پەیدا دەکات، کە ئەم ڕێکخستنە ڕەنگدانەوەی بەشێك لە پرۆگرامی جینەکانی

[12] temporal

باوانی منداڵەکەیە. خشتە یان پرۆگرامی جینی منداڵ، شێوەیەکی تەواو تایبەت بە خۆی بۆ دروستدەکاتو ئەو توانایەی پێدەبەخشێت کە کۆمەڵە سیفاتێکی کورت ماوەی دیار و تایبەت لە کەسەکە خۆیدا دەرکەوێت.

لە ئەنجامدا لەوانەیە ئێمە بەشێك لە ویستو نارەزوە هەستو رەفتارەکانی باوانمان بە میرات وەربگرین، ئەو بیرۆکەو کردارانەی لە هەموشتێك زیاتر دوبارە بونەتەوە لایان، توندو رەقترین تۆری دەماری دروست دەکەن، ئەم تۆرانە لە ئاییندەدا دەبنە بەکارهێنراوترین رێرەوی خولگەیی مێشکمان، بەم شێوەیە ئەو بەرنامانەی کە جێگیربوون بەدرێژایی ژیانی کەسەکە سەرهەڵدەداتەوە واتە دەردەکەوێتەوە. وەکو دەبینرێت ئێمە بیرۆکەو رەفتارو هەستەکانی هاوشێوەی باوانمان تیادا دەردەکەوێتەوە، چونکە ئەوانەی زۆرترین دوبارەیان هەیە لە بیرۆکەو رەفتارو هەستەکانمان ئەوانەن کە بە بۆماوە وەرمانگرتووە.

کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت ئێمە تەنها بەشێك لە تۆربەندی دەماری باوانمان بە میراتی بۆ دەمێنێتەوە. کۆمەڵە پەیوەندی سیناپسیەکان تەنها بەشێکی سیفاتی گشتی کەسێتیەو زانیاری ورد ناگرێتەوە، چونکە هەمو کەسێك میراتێکی جینی ناوازە وەردەگرێت. لە ئەنجامدا جینەکانمان مێشکێکمان بۆ بەرهەم دێنێت کە تایبەتمەندیو سیفاتەکانی لە هەموو کەسەکانی تر جیاواز دەبێت، شێوەی دەستە دەماریەکانی هەر کەسێك ناوازەو بێوێنەیە هەر ئەمەشە کە مۆڵەت بە هەمو کەسێك دەدات کە جیاواز لە کەسانی تر بیربکاتەوە. لە بنەرەتدا ئەوە تۆربەندی دەماری مێشکمانە کە کەسێتیمان وەکو تاکە کەسێك دیاریدەکات. ئەگەر دەستتان نمونەیەکی سیفاتی جینی درێژماوەتان بێت (لەو روانگەیەوە کە پێکهاتەی دەستی هەمو کەسێك وەکو یەك پێنج پەنجەیەو پەنجە گەورە لە هەموپەنجەکانی تر

زیاتر توانای جوڵەی هەیە..هتد) ئینجا دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە تۆڕبەندی دەماری تاکەکەسی ئێوە وەکو مۆری پەنجەکانە تەنها تایبەتە بەخۆت لە مۆری پەنجەی هیچ کەسێك ناچێت. ئەوە تۆڕبەندی دەماری مێشکتانە کە وای کردوە کە بێ هاوتا بن و لە هیچ کەس نەچن (جو دیسبونزا، ٢٠٢١،ل٢١٧)

# بەشی شەشەم

- چۆن لە دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی نێوان خوێندکاران تێبگەین؟
- مێشك چۆن فێردەبێت
- یەکەم تۆڕی ناسینەوە
- دابەشکردنی پرۆسەی ناسینەوە
- جیاوازی تاکایەتی لە تۆڕی ناسینەوەدا
- دووەم.تۆڕی ستراتیجی
- دابەشکردنی تۆڕی ستراتیجی
- جیاوازی تاکایەتی لە تۆڕی ستراتیجیدا
- سێهەم. تۆڕی هەڵچونی
- دابەشکردنی پرۆسەی هەڵچونی

## چۆن لە دەروونناسی جیاوازی تاکایەتی نێوان خوێندکار تێبگەین

دامو دەزگا فێرکاریەکانو پرۆگرامو شێوازەکانی وانەوتنەوە لە وڵاتانی تازەپێگەیشتودا کەموکورتی زۆری هەیە لەبواری ڕەچاوکردنی جیاوازی تاکایەتی نێوان خوێندکاراندا، ئەوەی هەیە لە پرۆگرامو شێوازی وانەووتنەوەدا وا دیزانکراوە کە گونجاو بێت بۆ هەموان، بێ ڕەچاوکردنی جیاوازی نێوان خوێندکارەکان، ووتنەوەی وانە لە خوێندگاکاندا تا ئێستاش هەر ووتنەوەو لەبەرکردنە(تلقین)، بە دڵنیاییەوە ئەوە ڕاست نییە کە یەك شێواز بۆ هەمو خوێندکارەکان گونجاو بێت، لەوانەیە شێوازێکی وانە ووتنەوە بۆ کۆمەڵە خوێندکارێك باش بێت، بەڵام بۆ ئەوانی تر گونجاو نەبێت، چونکە خوێندکارەکان جیاوازن بەو جۆرەش شێوازی فێربونیشیان جیاوازە لەیەکتر.

تێگەیشتن لە مێشك ئەو دەرگا سەرەکیەیە تا لە جیاوازی تاکایەتی نێوان خوێندکارەکان تێبگەین. مێشك تا ئێستاش نهێنیەکەی بەتەواوی نەدۆزراوەتەوە. زاناکان ئەوەی پێی گەیشتون لە زانیاری لەسەر چۆنیەتی کارکردنی مێشك هێشتا شتێکی کەمە، بەڵام زانا پەروەردەییو دەروونناسیەکان بە پشتبەستن بەو کەمە زانیاریەش هەوڵیان داوە ئەو زانیاریانە لە پێناو تێگەیشتنو پێشخستنی پرۆسەی فێربونو فێرکاریدا بەکار بهێنن. بتوانن وەڵامی چەند پرسیارێکی گرنگ بدەنەوە وەکو:

مێشك چۆن كار دەكات لەكاتی پرۆسەی فێربووندا؟

كەی باشتر فێردەبین؟ لەكام هەلومەرجدا؟

بۆچ هەندێك كەس جیاواز لە هەندێك كەسی تر فێردەبن؟

ئایا مێشكو ڕێكخستنی مێشك لە كەسەكاندا جیاوازە؟

لێرەدا ڕۆشنای دەخەینە سەر ئەو توێژینەوانەی كە لەسەر مێشك ئەنجام دراونو پەیوەندی بە خوێندنو شیكردنەوەی بەشێوەیەكی پەروەردەیی هەیە، لەگەڵ ئاماژەدان بە جیاوازی نێوان خوێندكاران. بۆ ئەوەی لە پرۆسەی فێربون باشتر تێبگەینو بۆ پەرەپێدانی بواری باشتر بۆ فێربونی خوێندكاران.

## مێشك چۆن فێردەبێت




ئاڵۆزی ڕێكخستنو پێكهاتەی مێشك وای كردوە كە ڕۆڵی سەنتەری هەبێت لەپرۆسەی فێربوندا، بەتایبەت بەشی توێكلی دەرەوەی مێشك، توێكلی مێشك

پەیوەندیو وابەستەیی سەرنجراکێشی تیادایە: زیاتر لە ترلیۆنێك خانەی دەماری بەیەکەوە وابەستەن، کە نزیکەی دە تریلیۆن پەیوەندییە تۆڕێکی چڕو ئاڵۆزی دروستکردوە، ئەم تۆڕە چڕە هاوکارە بۆ بەیەکگەیشتنی بەشەجیاوازەکانی مێشك بە ئاسانی .(Rose&Mary,2002)

لەنێو ئەم تۆڕە دەماریە چڕەدا تۆڕی ووردتر هەن کە پسپۆری ئەنجامدنی کاری تایبەتی پرۆسەی فێربوونن. سێ جۆر تۆڕی سەرەکی و دیار هەیە، کە لە پێکهاتەو ئەرك‌و ڕێکخستندا لەیەك جیاوازن، بەڵام هاوشان‌و بەیەکەوە گرێدراون وەك یەك گرنگن لە پرۆسەی فێربوندا ئەم تۆڕانە بەپێی کارو ئەرکیان ناو نراون: تۆڕی ناسینەوەو تۆڕی ستراتیجیو تۆڕی هەڵچونی، چالاکی ئەم تۆڕانە هاوشانی پێویستی فێربوونن:

١. تۆڕی ناسینەوە تایبەتە بە دۆزینەوەو دیاریکردنی واتای نمونە بینراوەکانە واتە، کار بۆ تێگەیشتن‌و دیاریکردنی زانیاریو بیرۆکەو چەمکەکان دەکات.
٢. تۆڕی ستراتجی تایبەتە بە داهێنان‌و چاودێریکردنی شێوازی بیرکردنەوەو جوڵەکردنەوە، واتە کار بۆ پلاندان‌و جێبەجێکردن‌و سەرنجدانی لێهاتوییو کردارەکان دەکات.
٣. تۆڕی هەڵچونی تایبەتە بە هەڵسەنگاندنی نمونەو شێوازەکان لەڕوی هەڵچونیەوە گرنگیان پێدەدات، واتە کار بۆ کارلێککردن لەگەڵ لێهاتوییو ئەرکەکان‌و هەروەها لەگەڵ جیهانی چواردەورمان دەکات .(Vygotsky.1962)

ئەم سێ جۆرە لە تۆڕە دەمارییەکان هەتا بۆ ئەرکێکی بچوکیش بەیەکەوە کاردەکەن. لە دوو تایبەتمەندی زۆر گرنگیشدا هاوبەشن:

- جێبەجێکردنی ئەرکەکان دابەشدەکەن بەسەر ناوچە جیاوازەکانی مێشکدا بە هاوتەریبی کار دەکەن (جێبەجێکردنی شێوەو ڕەنگ بەیەکەوە).
- جێبەجێکردن بە شێوەیەکی (قوچەکی)هەرەمی ئەنجامدەدەن، یارمەتی جێبەجێکردنی وەرگرتنو چونە ژورەوەی هێواشی زانیاریە هەستیەکان بەیەکەوە بۆ هەرەمەکە (لەخوارەوە بۆ سەرەوە)، و لەگەڵ چونە ژورەوەی خێرای وروژێنەرەکانی تر بۆ هەرەمەکە (لە سەرەوە بۆ خوارەوە) (سەیری شێوەی (١) بکە.




شێوەی(١)

پەیوەندی جیاوازی تاکایەتی بە مێشکەوە

لەگەڵ ئەوەی هەمو مێشکێك هاوبەشە لەم تایبەتمەندییە گشتییەدا، بەڵام هەر مێشکێك لەوەی تر زۆر جیاوازە ئەوەی ئەم جیاوازییە دروست دەکات ناسەواری پرۆسەی فێربونو فێرکردنە. تێگەیشتن لە ئەرکی ناسینەوەو پلاندانانو هەڵچونەکان ئەو توانایەمان پێ دەبەخشێت تا خاڵی لاوازو بەهێزی خوێندکاران دیاریبکەین. نیستاش ڕونکردنەوەی تەواو لەسەر هەر یەك لەو تۆڕانە دەدەین:

## یەکەم. تۆڕی ناسینەوە:

لەبەر ئەوەی دەکەوێتە پشتەوەی مێشك بۆیە هاوکارە بۆ شیکردنەوەو دیاریکردنی نمونە وروژێنەرەکان وەکو؛ شێوەی دەنگ، ڕوناکی، چێژ، بەرکەوتنو بۆنکردن، هەروەها هاوکارە بۆ ناسینەوەی ڕوخسار، دەنگ، وشەو پیتەکان، لەگەڵ نمونەی ئاڵۆزتری وەکو؛ شێوازی نوسەرو مانای شاراوەی وشەکانو چەمکە موجەرەدەکان وەکو دادپەروەری.

بۆ نمونە کەسێك دەتوانێت کەلوپەلو ئەساسی ناو ژورەکە بناسێتەوە وەکو کورسیو... هتد، ئەگەر لەسەر ئەو شتانە پرسیاری لێبکەین دەتوانێت دیاریان بکات وەکو دەسکی دەرگاکە، لەوانەشە هەندێك لەشتەکان زۆر بەرچاویش نەبن، بەڵام ئەم تۆڕ ئەوەندە بەهێزە کە دەتوانێت بەئاسانی ئەم شتانە بناسێتەوە. دەتوانێت شتی زیاتر بکات لەوەی تەنیا ناسینەوەی چەندین شت بێت لەیەك کاتدا، دەتوانێت ئەو شتە لە چەندین شتی تر جیا بکاتەوە، بۆ نمونە کورسی دەتوانێت ئەو کورسیە لەکورسیەکانی کە لە کۆندا بینیویەتی جیا بکاتەوە، دەتوانێت بزانێت کە ئەو کورسیە بەشێکە لەئەساسی ژورەکەو قەنەفەکان. ناسینەوە ئاسان دێتە بەرچاو، بەڵام لەڕاستیدا خۆی پرۆسەیەکی ئاڵۆزە وەکو لە خوارەوە تایبەتمەندیەکانی دەخەینە ڕوو.

## دابەشكردنی پرۆسەی ناسینەوە

ئەركی ناسیەنەوە بەگشتی دابەش دەبێت بەسەر ناوچە جیاوازەكانی مێشكدا كە هەر یەكەیان لەگەڵ یەكێك لە تایبەتمەندی یان پێكهاتەی ئەو شتەدا مامەڵە دەكات، ئەو دابەشكاریە تەنیا سنوردار نییە بەسەر بەشی بیستن یان بینیدا بەڵكو هەر بەشێك لەمانە بۆخۆیان دابەش دەبنەوە بۆ لقی زۆر وورد، بۆ نمونە ناسینەوەی وروژێنەرە بینراوەكان دابەش دەبێت بۆ سێ ڕەگەزی جیاواز وەكو بینینی ئاسۆیی، ستونی، ڕەنگەكانو جوڵە. كە هەمویان لەناوچەی لەیەكتر جیای مێشكدا ئەنجام دەدرێن.

(Gazzaniga, 1995; Mountcastle, 1998; Roland)

مێشك بەم جۆرە باشترو كاراتر كاردەكات وەكو ئەوەی كە ناوچەیەك لە مێشك بەیەكجار هەموو ئەركەكانی ئەنجامبدات، ئەگەر بەم شێوەیە بوایە دەبوو لەگەڵ هەر ئەركێكی نوێدا سەرلەنوێ خۆی بگونجاندایەتەوە.

ناسینەوە زۆر خێراو كارایە، چونكە هەموی بەهاوتەریبی بەیەكەوە كارەكە ئەنجام دەدەن. مێشكمان وا كاردەكاتو زانیارییەكان كۆدەكاتەوە كەلە ڕێگەی تۆڕی ناسیەنەوە دابەشكراوە لە كەمتر لە نیوچركەدا، یەكە بەیەكە بەستراوەكانی مێشك پەیوەندیان بەیەكەوە هەیە بەهۆی ڕاڕەوی زۆرەوە كە یارمەتی ناسینەوەی وروژێنەرەكانی بۆنو بینینو بیستنی هەستیەكان دەدات، كاریگەریان لەسەر یەكتریش هەیە. سەرنج بدە جاری وا هەیە وروژێنەرێكی هەستی یان بۆنكردن وا دەكات كە دركردنمان بۆ نمونەیەكی بینراو تێكبچێت (Mrartino,Marks,2000).

سروشتی دابەشكردنی تۆڕی ناسینەوە ئاسەواری درێژمەودای هەیە لەسەر جیاوازی ئاگایەتی، ئەگەر توانای ناسینەوە تەنیا بەیەك ناوچەی مێشكەوە سنوردار بوایە ئەوا ئەو توانای ناسینەوەیە لەیەكێكەوە بۆكەسێكی تر زۆر

جیاواز دەبوو. جیاوازی لە ناسینەوەدا لەوانەیە ببێتە هۆی کاریگەری فراوانو گشتگیر. بۆ نمونە ئەگەر هەستی بینین ئەنجامی یەك لقی تۆڕێکی دەماری بوایە ئەوا گۆڕانکاریەکی کەمیش کاریگەری لەسەر بینین بەتەواوی دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی ناسینەوە کارێکی هەماهەنگی یە جیاوازەکانە، ئەوا هەر ڕەگەزێکی بچوکی ناسینەوە دەتوانێت جیاوازی لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر پەیدابکات.

ناسینەوە بەندە بە جێبەجێکردنی چینەکانەوە لەسەرەوە بۆخوارەوە لەخوارەوە بۆسەرەوە. ئێمە ئەوەمان زانی کە هەر نمونەیەکی وەکو؛ ڕەنگ، شێوە، جوڵە لە ڕێگەی ڕاڕەوی ناو تۆڕی ناسینەوە وە مامەڵەیان بەشێوەیەکی هاوتەریب دەکرێت. هەر یەکێك لەم ڕاڕەوانە بە شێوەیەکی چین بەچین ڕێکخراون. هەندێکیان ئاڵۆزنو هەندێکیشیان سادەو ساکارن هەیانە مامناوەندیە.

کاتێك لە ڕێگەی چاومانەوە زانیاری شتە بینراوەکان وەردەگرین دەگوێزرێتەوە بۆ شەبەکیەو پاشان بۆ ژورتر لەڕێگەی تۆڕێکی چینی ئاڵۆزترەوە وردەوردە دەگاتە ناوچەی بینین، بەم جێبەجێکردنە دەوترێت لەخوراەوە بۆ سەرەوە، لەم ڕێگەیەدا وردەکاری بۆ نمونە ژوری دانیشتنەکە دەناسینەوە، ئەم جۆرە لە جێبەجێکردن بەرپرسە لە دیاریکردنو تەرکیز دەخاتە سەر هەستکردنە تایبەتەکان. بۆیە جۆری ئەو هەستانەی وەریدەگرین زۆر گرنگن. وەکو ڕوناکی کەم، یان وێنەیەکی خراپ، لەوانەیە ئەرکی ناسینەوەی ڕۆژانەمان قورس بکات.

بەهامان ڕێژە، ئەو زانیاریانەی دەچن بۆ سەرەوەی بونیادی ناسینەوەی چین بەچین هەمان زانیاریە کە دەچێت بۆ چینی ژێرەوە، بۆ ئاسانکاری ناسینەوەی وردەکاریەکان، مێشك زانیاری زۆر ئاڵۆزتر وەك زانیاری گشتیو

ناوەڕۆك‌و شێوەی گشتی. کاتێك چاوێك بە ژوری دانیشتنەکەدا دەگێڕێت (زانیاریەکان کۆکراوەتەوە بەهۆی ناسینی شتەکانی ژورەکەوە) (بەشێوەی لە خوارەوە بۆ سەرەوە) بۆ ئەوەی یارمەتیت بدات بۆ ناسینی ئەو شتانەی تر، کە قورسە لە ڕێگەی تەنها وردەکاری بینیەوە بناسرێنەوە.

جێبەجێکردنی ناسینەوە لەخوارەوە بۆ سەرەوەو لەسەرەوە بۆ خوارەوە، هەردوکیان گرنگن بۆ پرۆسەی فێربون، بۆ نمونە فێربونی خوێندنەوە، وا دانراوە کە خوێندنەوە چالاکیەکی لە خوارەوە بۆ سەرەوەیە، پیتەکان دەناسرێنەوە وپاشان دەخوێنرێنەوە دەخرێنە ناو وشەکانەوە وپاشان واتاکەی شیدەکرێتەوە. بەڵام توێژینەوەکان ئەوەیان سەلماندوە، کە ناسینەوەی پیتەکان لەناو وشەکاندا ئاسانترو زووتر دەناسرێتەوە وەك لەوەی پیتەکان بەتەنیا بن. چونکە ناسینەوەی نمونە گەورەکە (وشەکەیە) ڕێگر دەبێت لە ناسینەوەی لە خوارەوە بۆسەرەوە، بۆ ناسینەوەی پیتێك بە جیا پشت دەبەستێت بە پێشبینی خوێنەر کە کام پیتەیە. کەمتر پشت بە شێوەو بینینی پیتەکە خۆی دەبەستێت، بۆیە ڕاستکردنەوەی دەقێك لە ڕێگەی خوێندنەوەی دەقەکەوە زۆر قورسە، زۆرجار هەڵەکان نابینن، چونکە پێشبینیمان بۆ وشەکە بەهێزترە بەجۆرێك کاریگەری دەکاتە سەر بینینمان بۆ وشەکە خۆی کە دەیخوێنینەوە و ڕاست دەیبینین. بەکارهێنانی واتاو ناوەڕۆك نمونەیەکی ترە بۆ جێبەجێکردن لە سەرەوە بۆ خوارەوە کە لەکاتی خوێندنەوەدا بەکاردێت.

لەبەر ئەوەی تۆڕەکانی ناسینەوە پشت بە هەردو پرۆسەکە دەبەستێت، لەسەرەوە بۆ خوارەوەو لە خوارەوە بۆ سەرەوە، بۆیە دەبێت پرۆسەی فێربون تەرکیز بخاتە سەر هەردو پرۆسەکە نەك یەکێکیان. زۆربەی پرۆگرامەکانی فێرکردنی خوێندنەوە پشت بە هەردو پرۆسەکە دەبەستێت؛ ڕێگای زمان کە

لەسەرەوە بۆ خوارەوەیە، ڕێگەی دەنگی کە لە خوارەوە بۆ سەرەوەیە. ئەم ڕێگە هاوسەنگە و گونجاوە لەگەڵ ڕێگای فێربونی مێشکدا.

## جیاوازی تاکایەتی لە تۆڕی ناسینەوەدا

بەشێویەکی گشتی مێشکی تاکەکان هەمان پێکهاتەیان هەیە. بەنزیکی شتەکانیش وەکو یەك دەناسنەوە، بەڵام تۆڕەکانی ناسینەوە بەشێوەو قەبارە نمونەی جیاواز جیاوازن. توێکاریو وابەستەییە فیزیاییو کیمیاییەکان دەریانخستوە کە هەریەکەمان مێشکێکی تاڕادەیەك جیاوازمان هەیە لەوانی تر.

بۆ نمونە هەندێك کەس کاتێك شتێکی بینراو دەناسێتەوە چالاکی لە بەشی دواوەی مێششکیاندا زیاتر دەبێت. بەڵام ئەم چالاکیە زیادەیە لەڕوی چەندێتیو شوێنو دابەشبونەوە لەیەکتر جیاوازن. لەوانەیە ئەو ناوچەیەی کە چالاك دەبێت گەورەتر بێت، یان بچوکتر، زیاتر لە لای ڕاست یان لای چەپ بگرێتەوە، یان لەوانەیە زۆر فراوان بێت یان دابەشبونەکەی لەیەك نزیك بێت. بێگومان ئەم جیاوازیانە لەو شێوازەدا دەردەکەوێت کە خەڵکی شتەکانی پێدەناسنەوە لەم جیهانەدا.

سروشتی دابەشکردنی جێبەجێکردنی ئەرکەکە لە مێشکدا دەبێتە هۆی جیاوازی بێسنورو گران تێگەشتنو ناسینی خوێندکارەکان. ئەمە وەکو بیرۆکەی تواناکانی (IQ) زیرەکی ستاندفۆرت بینیە نییە. توانای خوێندکار فرە ڕەهەندە کاتێك دو خوێندکار ئەرکێکی ئەکادیمی جێبەجێ دەکەن ئەو ناوچانەی لە مێشکیاندا چالاك دەبێت زۆر لەیەکتر جیاواز دەبێت، هەروەکو مۆری پەنجەیان. لەوانەیە ئەم جیاوازیە دەرنەکەوێت لە ئاستی چالاکی مێشك بە گشتی بەڵکو لە نمونەی چالاکیەکەدا دیار دەبێت چالاکیەکە چۆن

بەسەر ناوچە جیاوازەکانی مێشکدا دابەش بووە، بۆیە تەنها یەك پێوەر نییە بۆ پێوانەکردنی چالاکی مێشك، کەواتە یەك نمرەی فێربوون ناتوانێت وەسفی خوێندکارەکان بە ڕێگەیەکی ڕاست بکات.

بۆچونی کلاسیکی بۆ بێتوانایی خوێندکاران لەسەر بنەمای تاکرەهەندی وەزیفی مێشك بڕیار دەدات کە فڵانە خوێندکار کەمتوانایە یان بەتوانایە. بەڵام تێگەیشتنی تازە بۆ سروشتی دابەشبوونی جێبەجێکردنی ئەرکی دەماری ئەوە دەردەخات کە توانای بوارە جیاوازەکان بەندە بە ژمارەیەکی زۆری پەیوەندیە دەماریەکان لە مێشکدا. ئەمە ئەوە ڕوندەکاتەوە بۆچی منداڵێك کە توانای جیاکردنەوەی دەنگی پیتەکانی هەبێت، بەڵام لای گران بێت پیتەکان بناسێتەوە. ئەو کاتە ئەم منداڵە وەکو منداڵێکی خاوەن پێداویستی تایبەت کە زەحمەتیکانی فێربونی هەیە دەناسرێت. بەڵام منداڵێکی تر کە دەنگو ئاوازەکان جیاناکاتەوە، بەڵام دەتوانێت وشەکان بە ئاسانی بخوێنێتەوە ئەو کاتە ئەم منداڵە ناچێتە ناو پۆلێنی زەحمەتیەکانی فێربونەوە. جیاوازی دیار لە تۆڕی ناسینەوەی خوێندکارەکاندا هەیە لەنێوان؛ هەیانە بەزەحمەت دەناسنەوە، هەیانە زۆر بە زەحمەتی دەناسنەوە.هەیانە مامناوەندن ل ناسینەوەدا.

وەکو دەزانین کاتێك مامۆستا ئەم وانانە دەڵێتەوە بەیەك شێواز بۆ هەمو خوێندکارەکان پێشکەشی دەکات. بەڵام جیاوازی ڕونو ئاشکرا لە نێو خوێندکارەکاندا هەیە، بۆیە پێشنیاری دروست ئەوەیە کە تا چەند شێوازی وانەوتنەوەی جۆراوجۆر بێت ئەوەندە زۆرترین ژمارەی خوێندکارلە وانەکە تێدەگەن. ناسینی سروشتی دابەشکردنی پرۆسەی ناسینەوە (لەخوارەوە بۆ سەرەوە، لە سەرەوە بۆ خوارەوە) دەتوانیت کۆمەکی مامۆستا بکات بۆ باشتر ناسینی خوێندکارەکانی. بۆ نمونە: کوێستان مامۆستایەکی بە ئەزمونی

قۆناغی سێهەمی بنەڕەتییە، جیاوازی تاکایەتی خوێندکارەکانی زۆر ئاشکرایە، ئامانجی ئەم مامۆستایە ئەوەیە، کە هەمو خوێندکارەکانی لێهاتویی زمانەوانی پێویستیان فێربکات پێش ئەوەی بچنە قۆناغی چوارەمی بنەڕەتی. خوێندکارێکی هەیە بەناوی(لانە) ئەگەرچی لە شیکردنەوەو نوسینی وشەکان بە تەنیا زۆر باشە، بەڵام لە خوێندنەوە تێناگاتو لاوازە لە واتا بەخشین بە کۆی دەقە نوسراوەکە. خوێندنەوەی هێواشە ئەوەش نیشانەیە کە زەحمەتی هەیە لە پێشبینی وشەکانو بیرۆکەکان لەکاتی خوێندنەوەدا. تایبەتمەندی تری ئەم خوێندکارە ئەوەیە کە زۆرجار کەلوپەلەکانی خۆی ون دەکات. قسەکان وشە بەوشە لێك دەداتەوە. ئەو ناتوانێت لەو نوکتانە تێبگات کە هاوڕێکانی دەیکەنو پێی پێبکەنێت. بۆیە زۆربەی هاوڕێکانی وەکو کەسێکی نامۆ سەیری دەکەن. لە ڕێگەی یاریکردنەوە لانە توانیویەتی هاوڕێیەتی لەگەڵ منداڵەکاندا دروست بکات. سەرباری خاڵی لاوازو بەهێزی ئەم خوێندکارە. دەتوانین ببینین کە ئەو لە ئاستی یەکەمی جێبەجێکردندا لێهاتوە، ئەویش ناسینەوەی وشەو دەنگەکانە بە تەنیا واتە لە خوارەوە بۆ سەرەوە. بەڵام ئەوەی لای قورسە لەسەرەوە بۆ خوارەوەیە. بەستنەوەی ئەوەی فێری دەبێت بە زانیاریەکانی ترەوەو ناسینی ناوەڕۆکی بۆ هەردو جۆری زمانی نوسراوو ووتراو.

پێویستە لەسەر مامۆستاکەی هاوکاری بکات بۆ ئەوەی پێشبینی بۆ ناوەڕۆکی ئەو دەقە نوسراوە بکات کە دەیخوێنێتەوە. هەوڵ بدات کە کۆبیری لەسەر شیکردنەوەی وشەکان بەتەنیا کەمبکاتەوە ئەو هەنگاوانەی فێربکات بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی ئەو نوسینەی دەیخوێنێتەوە.

## دووەم. تۆڕی ستراتیجی:

لەڕێگەی ئەم تۆڕەوە پلان دادەنێینو جێبەجێی دەکەینو چاودێری نمونەی بیرکردنەوە و جوڵەکانی ناوەوە دەبین، زۆربەی ئەو کارانەی دەیکەین وەکو شتنی قاپەکان، جل لەبەرکردن، ڕۆیشتن، ڕاکردن یان نوسینی ڕاپۆرتێك، لەوانەیە بە تەواوی ئاگامان لە ستراتیجێکی دیاریکراو بێت کە پەیڕەوی دەکەین. ئەو شتەی کە هەمومان نایزانین ئەوەیە، کە بۆ هەمو کارێکی دەیکەین ستراتیژێکی دیاریکراو هەیە جا ئاگامان لێ بێت یان لێی بێ ئاگابین.

ڕەگەزەکانی ستراتیجی ئەرکەکانی ڕۆژانە مەرکەزیەتی ستراتیجی فێرکردنو مەعریفە شیدەکاتەوە. ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ ژوری دانیشتنەکە جارێکی تر هەوڵ بدەین کە جۆری ژورەکە دیاری بکەینو بیناسین لەوانەیە بۆ ناسینی کەلو پەلی ژورەکە هیچ ئاستەنگێکت نەبوبێت، بێ ئەوەی بەئاگابیت لەوانەیە پشتت بە تۆڕی ستراتیجی بەستبێت بۆ ئەوەی بڕیاری ئەوە بدەیت. هەموو نیش و کارێك پێویستی بە ستراتیژ و پلاندانان هەیە، بۆ نمونە لە ئاسانترین کاردا وەکو گەڕان بەدوای وێنەیەکدا دەبێت هەندێك هەنگاو دابنێیت وەکو:

**دیاریکردنی ئامانج**

**دانانی پلانێکی گونجاو**

**جێبەجێکردنی پلانەکە**

**چاودێرکردن**

**ڕاستکردنەوە یان چاکسازی کردارەکان**

تۆڕی ستراتیجی مێشکمان ئەم کارانە زۆر بە کارامەیی ئەنجام دەدات هەر وەکو تۆڕی ناسینەوە.

## دابەشکردنی تۆڕی ستراتیجی

ئەو تۆڕە دەماریانەی بەرپرسی دروستکردنی نمونەی عەقڵیو جوڵەییەکانن، ناوچەیەکی باش داگیردەکەن کە دەکەوێتە بەشی پێشەوەی توێکڵی مێشك (فرۆنتاڵ).

ئەو توێژەی دەکەوێتە پێش ناوچەی پێشەوە (الجبهیە) چاودێری توانا ستراتیژیە ئاڵۆزەکان دەکات زۆر گرنگیشە بۆ دیاریکردنی ئامانجو هەڵبژاردنی پلانی گونجاو. نمونەی چالاکیەکانی ئەم ناوچەیە بەشێوەیەك دابەشبووە کە یارمەتیمان بدات بۆ پلاندانانو جێبەجێکردنی کارەکان. ئەم ناوچانە بەشێوەیەکی هاوتا کاردەکەن، بۆیە دەتوانین چالاکییە ئاڵۆزەکان بە ئاسانی ئەنجام بدەین. بۆ نمونە ژەنینی پیانۆ؛ ئەگەر کارەکە هاوتەریب ئەنجام نەدرێت لە ڕێگەی تۆڕە ستراتیژیەکانەوە ئەو کاتە ژەنیارەکە ناتوانێت هەماهەنگی بکات لە نێوان دوگمەو بەشەکانی تری ئامێرەکەدا.

ئەگەرچی ئەم ناوچانە بە هاوناهەنگی کارەکانیان دەکەن لە هەمان کاتیشدا سەربەخۆن لەیەکتر. پەیوەندی ئەم ناوچانە بەیەکەوە هۆکارە بۆ ئەنجامدانی کاری جۆراوجۆر و کاریگەریان بۆ سەر یەکتر دەبێت (Fowler, 1981).

ئەمەش ئەوە شیدەکاتەوە، بۆ نمونە تۆپ بەجۆرێك دەگریت ئەگەر بتەوێت یاری بکەیت، بەجۆرێکی تر دەیگریت ئەگەر ویستت هەڵیبدەیت بۆ هاوڕێکەت. هەر وەکو قسەکردن کاتێك تۆ قسەدەکەیت ناوچەی بەیەکەوە پەیوەستو سەربەخۆ هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی ووتنی بڕگەو وشەکان لە هەمانکاتدا. چونکە جۆری گۆکردنی وشەیەك بە وشەی دواتری کاریگەر دەبێت. هەر بۆیە ئەو ڕیکلامە دەنگیانەی کە لە ئامێرەکانەوە بڵاو

دەكرێنەوە كەمێك بۆمان نامۆو ناخۆشن. یان كاتێك تەلەفون دەكەیت بۆ ئاسیاسێل تا كێشەیەكی مۆبایلەكەت بۆ چارەسەر بكات ئامێرەكە وەڵام دەداتەوە. دەنگی ووتنی وشەكانی ئەو وەڵامدەرەوە ئامێریە وەك یەك وایە ئەگەر ناوەڕۆكی پەیامەكەی هەرچیەك بێت. بۆ نوسینیش كاتێك دەنوسین پیتەكان بە جۆریك دەنوسین بەپێی ئەو پیتەی كە لە دواوەی دێت دەیگونجێنین.

ئەگەر مامۆستا ئاگای لە سروشتی دابەشكردنی كاری ستراتیجی بێت یارمەتی دەدات بۆ تیگەیشتنی باشتری خوێندكاران، دەتوانێت پلانی كارەكان بەجۆرێك دابنێت كە یارمەتی خوێندكاران بدات. بۆ نمونە مامۆستا داوا لە خوێندكارەكانی بكات كە فێری لێهاتویی: گوێ گرتن، كورت كردنەوەی زانیاری پەیوەندیدار، نوسینی زانیاریەكان، وەرگرتنو نوسینی تێبینیەكان لەكاتی وانەكەدا.

فێركردنی لێهاتوییەك بەیەكەوە باشترە وەك لە جیاكردنەوەی هەنگاو بە هەگاوی بەشەكانی لێهاتویەكەو فێركردنی جیابەجیا. وەكو ڕاهێنەری تۆپی تێنس كە لە تۆپەكە دەدات هانی یاریزانەكەی دەدات. لێدان لە تۆپەكە، پاشان هاتنە دواوە، پاشان هەنگاوێك بۆ پێشەوە، پاشان چاودێری تۆپەكە بكە. وەك نوسین ڕاپۆرتێك دەبێت بەشو وردەكاری نوسینی ڕاپۆرتەكە بەهۆی نوسینی هەمو بەشەكانی ڕاپۆرتەكەوە بەیەكەوە فێر دەبێت، ئەو كاتە دەتوانیت بەشە وردەكانی بۆ ڕاستبكەیتەوە.

ستراتجی پێویستی بە جێبەجێكردنە لە خوارەوە بۆ سەرەوەو لەسەرەوە بۆ خوارەوە هەیە. یەكەكانی ستراتیجی ڕاڕەوێكی هەرەمی دو سەرە پێكدەهێنێت، ئاماژە دەماریەكان لەو ناوچانەی كە ئەركی بەرزیان هەیە لە مێشكدا دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو ناوچانەی خوارەوە وەكو دڕكەپەتك كە خانە

دەماریەکانی لێیە بۆ هاندانو جوڵاندنی ماسولکەکان کە یارمەتی ئەو ستراتیژیە دەدات کە لە ناوەوە دەجوڵێنرێت وەکو (ئەم پێنوسە هەڵدەگرم) کاریگەری دەکاتە سەر ئەوەی کە ئێمە چۆن لە ژینگەدا مامەڵە دەکەین (هەلگرتنی پێنوسەکەیە). ئەو یەکانەی پسپۆرن لە جێبەجێکردنی هەنگاوی جۆراو جۆردا لە ڕێگەی زنجیرێك لێهاتویی دەکەوێتە ئاستی جیاوازی ئەو ڕارەوەوە.

چینە بەرزەکان هەنگاوەکان ڕێکدەخەن، فەرمان بە ماسولکەکان دەدەن تا بجولێو ئاڕاستەکەی بپارێزێت نیتر ئایا گەیشتوە بە ئامانجەکە یان نا گۆڕانکاری لە پلانەکەدا دەکات کە دەیەوێت. لە کاتێکدا کردارەکان پیادە دەکرێنو تەواو فێردەبێت نیتر چاودێری کردنی لەسەرەوە زۆر پێویست نابێت. ژەنیاری پیانۆکە دوای چەند ساڵ لە ژەنین نیدی پێویستی بە چاودێری کەمی خودی خۆیو بە ئاگابون هەیە (دەبێت بە خوو).

پرۆسەی لەسەرەوە بۆ خوارەوە هاوکاریمان دەکات لە جێبەجێکردنی پلانێکدا کە لە چینە دەماریە باڵاکاندا دانرابێت. کاتێك وەکو مامۆستا ئامانجەکانمان دەردەبڕینو ڕێنمایی زارەکی دەدەین بە خوێندکارەکان بەمەش پاڵپشتی پرۆسەی لەسەرەوە بۆ خوارەوە دەکەین لای خویندکارانو بەدوپاتکردنەوەی لێهاتوییە ستراتیجییەکان خوێندکاران هاندەدەن لە ڕێگەی ئامانجو پلانی ڕونو ئاشکراوە.لە تۆڕی ستراتیجیدا تەنیا زانیاریەکان لەسەرەوە ناچن بۆ خوارەوە بۆ ماسولکەکان بگرە لە خواریشەوە واتە لە ماسولکەکانەوە دێن بۆ سەرەوە بۆ مێشك لە یەك سەرچاوەی ڕارەوەی ستراتیجیەوە ئەویش مێشکۆکەیە. کە دەکەوێتە کۆتایی بنکەی مێشکەوە کە(Brainstem) کۆتایی سەرەوەی درکە پەتکی داپۆشیوە. ئەو ڕاڕەوە دەمارانەی لە مێشکۆکەوە دەچن بۆ یەکەی ستراتیجی ناو مێشکۆکە ڕۆڵی

گرنگیان هەیە لە پرۆسەی فێربون‌و ستراتیجیدا. مێشکۆکە فیدباکی هەستی وەردەگرێتەوە. ئینجا دەیخاتە بواری جێبەجێکردنەوە واتە دەیکات بە کردارو مامەڵەکان‌و بەراوردی دەکات بە سیگناڵ‌و ئاماژەکانی ترو مامەڵەی مەبەستدار دەنێرێت. کەواتە لە ڕێگەی ئەم پرۆسانەوە مێشکۆکە هەواڵ دەداتە تۆڕە ستراتیجەکانمان ئایا کارو کردەوەکانمان بە پێی پێویستە یان نا (وەکو فیدباکە بۆ کارەکان)؟ ئەمە وەکو گەرمی پێو وایە بەڵام کردارەکانمان دەپێوێت.

خوێندکار بۆ فێربونی لێهاتویی پێویستی بەهەردو ستراتیجیەکە هەیە: لەخوارەوە بۆ سەرەوە، هەروەها لە سەرەوە بۆ خوارەوە. بۆیە تەنها دابینکردنی فێربونی باش بەس نییە، بگرە کاتێك نمونەی باشیان لەبەردەمدا بێت وەکو (چیرۆکی کەسە سەرکەوتوەکان بکرێتە بابەتی خوێندنەوەو ڕاپۆرتی لەسەر بکەن) زۆر باشتر فێردەبن سەرباری ئەوەی کە دەبێت بواری ڕاهێنانیان هەبێت لەگەڵ وەرگرتنی فیدباکی تایبەت بە بابەتەکە بە بەردەوامی. واتە ئامانجی دورمەودایان لا دروست بکەین تا تموح‌و جۆش‌و خرۆشیان بەرامبەر ئەرك‌و کارەکان بۆ دروست ببێت، ئەو کاتە ئەرکی خوێندن بەناچاری ئەنجام نادەن، بەڵکو پاڵنەری ناوەکیان بۆ دروست دەبێت تا بە جۆشەوە ئەنجامی بدەن.

## جیاوازی تاکایەتی لە تۆڕە ستراتیجیەکاندا

ڕێکخستن‌و دابەشکردنی تۆڕە ستراتیجیەکان زۆر ئاڵۆزە، چونکە یەك تۆڕی گونجاو نییە کە وەك یەك مامەڵە بکات. بێتوانایی لەبەشێکی تۆڕەکەدا بەشەکانی تریش بێتوانا دەکات. ڕەگەزی بەهێزی‌و بێهێزی وەکو یەك

لەوانەیە کاریگەری بکاتە سەر ڕەگەزی زۆر دیاریکراو لە لێهاتویی ستراتیجیدا.

بۆ نمونە خوێندکارێك لەوانەیە لێهاتوو بێت لە دانانی پلاندا، بەڵام لە خۆکۆنترۆڵکردندا بۆ جێبەجێکردنی پلانەکە لاواز بێت. خوێندکارێکی تر لەوانەیە لێهاتو بێت لە پەیداکردنی زانیاریدا، بەڵام لەوانەیە ڕێکخستنی زانیاریەکانی لا قورس بێت.

جیاوازی لە ئاستی جێبەجێکردنی لە خوارەوە بۆ سەرەوە و لەسەرەوە بۆ خوارەوە ئەمانە کاریگەری دەکاتە سەر وەرگرتنی لێهاتویی لەلایەن خوێندکارەوە. هەمومان کەسێکمان بینیوە کە زۆر لێهاتوو بووە لە چاودێری کردنی کارکردنی کەسێکی تر، دواتر توانیویەتی ئەم کارە زۆر بە باشی ئەنجام بداتەوە. ئەمە ئاماژەیە بۆ جێبەجێکردنی ستراتیجی زۆر بەهێزی لە سەرەوە بۆ خوارەوە. خوێندکاری تریش هەیە ئەگەر کارەکە بەدەستی خۆی ئەنجام نەدات فێر نابێت. خوێندکاری تر هەیە لەدوای دوبارەکردنەوەیەکی زۆری کارەکە و وەرگرتنی فیدباك ئینجا فێردەبێت. ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ستراتیجی لە خوراوە بۆ سەرەوە لای ئەمان بەهێزە. ناسینی ئەم جیاوازیانە هاوکاری مامۆستایە بۆ داڕشتنی ستراتیجی فێربونی جۆراو جۆر کە گونجاو بێت بۆ خوێندکارەکانی.

### با سەیری ئەم نمونەیە بکەین

سامان چەند ساڵە مامۆستای قۆناغی شەشەمە، ئامانجی بۆ خوێندنی ئەمساڵ ئەوەیە کە پلانێکی وانەوتنەوە داڕێژێت بۆ بابەتەکەی تا هەمو خوێندکارەکانی لێی تێبگەنو فێرببن سەرباری جیاوازی تواناکانیان. سامان باسی خوێندکارێکی دەکات ناوی(لالۆیە) ووزەیەکی زۆری هەیەو زۆریش

چالاکە، هەمیشە لە جێگای خۆی بەرز دەبێتەوە تا وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە. زۆربەدوای زانیاری تازەشدا دەگەڕێت دەیەوێت کاری تازە بکاتو لەگەڵ ئەوانی تریشدا کار دەکات. بەڵام زۆر کەم کارەکانی تەواو دەکات. هەر ئەوەندەی بێزار بو لەکارەکەی بەردەستی یەکسەر دەستی لێبەر دەداتو تەواوی ناکات. وەکو نوسنی ڕاپۆرت یان تاقیکردنەوەی فیزیا. بۆ کارە کورتخایەنەکانیش هەر وایە وەکو دۆزینەوەی واتای وشەیەك لە فەرهەنگدا. زۆر کەم لالۆ ئەرکی خوێندنگەی تەواو کردبێت زۆرجار هەر لەبیریشی نامێنێت ئەرکەکانیماڵەوەی ئەنجامبدات. هەتا هەندێ جار کتێبەکانیشی لە قوتابخانە بیر دەچێت.

لەوانەیە لەیەکەم سەیرکردنی کێشەکەی لالۆیە بڵێن پێویستە ئەو شتانەی کە مێشکی ئەو بڵاودەکەنەوە لە چواردەوری لابرێت، دوای ئەوەی کە ئەو شتانەی چواردەوریشی لابراوە هەر بەو شێوەیە تەرکیزی بە سادەترین شت بڵاو دەبێتەوە، مامۆستاکەی سەرنجی داوە لەسەر ئەو چالاکیانەی کە خۆی حەزی لێیەتی دەمێنێتەوەو تەرکیزشی بەردەوام دەبێت. کەواتە کێشەی لالۆ ئەوەیە کە دەبێت لێهاتویی ستراتجی فێر ببێت بەتایبەت تونای پلان دانانو خۆ کۆنترۆڵ کردنو تەواو کردنی ئەرکو کارەکان.

## سێهەم تۆڕی هەڵچونی

فێربوون، مامەڵەکردنی ژینگەی دەرەکی وا دەخوازێت، بابەتی ڕەنگاو ڕەنگ کە ناوەڕۆکی جیاوازیان هەبێت بەکاربهێنرێت. بەڵام خوێندکارەکان لە هەمان هەڵوێستدا هەر بەشێوەی جیاواز فێردەبن. با بگەڕێینەوە بۆ ژوری دانیشتنەکە، دەتوانین بڵێین یادەوەری، کەسێتی، پاڵنەرەکان، باری دەرونی، گرنگیپێدانەکان، باری جەستەیی هەمو ئەوانە ئەوە شیدەکەنەوە کە تۆ چۆن

مامەڵەی شوێنو هەڵویستەکان دەکەیت. بێگومان ئەم هەمو سیفاتو بارە دەرونیانە بە پێی جیاوازی کەسەکان زۆر دەگۆڕێن، دەرونناسێك دەتوانێت سەرنجی دەربڕینی ڕوخساری کەسەکان بدات، ئەندازیاری دیکۆر لەوانەیە دیکۆری ژورەکە سەرنجی ڕابکێشێت، مۆسیقاژەنێك سەرنجی پیانۆکە بدات، ئەگەر پرسیار لە هەر یەکەیان بکەین هەر یەکەیان چ بۆچونێکیان هەیە لەسەر دیمەنی ئەم ژورە، ئەوا وەڵامی جیاوازمان دەست دەکەوێت.

هەڵچونەکانیش وەکو ناسینەوە و ستراتیجی دەگەڕێتەوە بۆ تۆڕە پلان بۆ دانراوەکان کە لە مێشکدا هەن، تۆڕی ناسینەوە پارمەتی دیاریکردنی شتەکان دەدات وەکو ئەوەی بزانین کە ئەوە قۆری چایە، تۆڕی ستراتیجی پارمەتی ناسینو چۆنیەتی بەکارهێنانی دەدات وەکو ئەوەی چۆن چای تێبکەین، تۆڕی هەڵچونیش گرنگی شتەکە دەبەستێتەوە بە کاریگەری لەسەر ئەوەی دەیکەین و دەیبینین. ئەو شتە تا چەند لامان گرنگە ئیتر ئەوەیە چاخواردنەوەمان حەز لێیە بۆیە قۆریەکەشمان لا خۆشەویست دەبێت.

میرڤ و زاجۆن، ١٩٩٣ ئەوەیان دیاریکردوە کە مێشکمان توانای هەڵسەنگاندنی گرنگی هەر شتێکی هەیە لە ماوەی کەمتر لە چارەکە چرکەیەکدا. لەگەڵ ئەوەی ئەم پرۆسەیە ئاڵۆزە کەچی زۆر بەخێرایی ئەنجام دەدرێت؟ ئەمە چۆن ڕودەدات؟

### دابەشکردنی پرۆسە هەڵچونیەکان

وەکو دەزانین دیاردەی هەڵچونی زۆر ئاڵۆزترو هەڵخەڵەتێنەر ترە لە ستراتیجیو ناسینەوە. بەڵام جێبەجێکردنی دەماری هەڵچونی بەهەمان ڕێگا ڕودەدات. ئەم تۆڕە هەڵچونیانە لە یەکەی زۆر پسپۆر دروستبوون کە پێشتر

کۆنترۆڵی زۆر ناوچەی مێشك دەکەن وابەستەن بە سیستمی لیمبکەوە (Damasio,1994) هەندێك لەو یەکانە دەبینرێن.

لەبەر ئەوەی تۆڕی هەڵچونی لە ڕێگەی زۆر یەکەوە دابەش بووە، بەشێوەیەك کاریگەری زۆر جیاواز دەکاتە سەر پرۆسەی فێربون دواتریش پەیوەندی بەردەوامی بە ئەرکی فێربونەوە هەر هەیە.

ئەو بەڵگانەی کە دەستکەوتون ئاماژەن بۆ دابەشبونی تۆڕی هەڵچونی لەو کەسانەدا کە بەشێك لە مێشکیان لەناوچوە یان پوکاوەتەوە. هەندێك لەو نەخۆشانە دەتوانن هەڵچونەکانیان دەربڕن، بەڵام ناتوانن هەڵچونەکانی کەسانی تر لە ڕوخسارياندا یان لە دەنگیاندا بناسنەوە. هەندێکیان بە پێچەوانەوە دەتوانن هەڵچونەکانی ڕوخساری کەسانی تر بخوێنێتەوە، بەڵام خۆی ناتوانێت هەڵچونەکانی دەربڕێت. ئەم دو حاڵەتە پەیوەندی بە لەناوچونی بەشێکی تایبەتی مێشکەوە هەیە.

ئەوەی توێژینەوەکان پێمان دەڵێن ئەوەیە کە ئێمە بۆ ناسینەوەی هەڵچونەکان بەشێکی تۆڕی هەڵچونەکانی مێشکمان بەکاردەهێنین‌و بەشێکی تریش بۆ دەربڕینی هەڵچونەکانە لەگەڵ توانای شیکردنەوەی دەربڕینی ڕوخسارەکان‌و ناوەڕۆکی قسەکان.

تۆڕی هەڵچونەکان بە هاوتەریب بەیەکەوە کاردەکەن جۆری جیاوازی داتای هەڵچونی تاوتوێ دەکەن هاوکات لەیەکەوە زۆر نزیك‌و پەیوەندی زۆریشیان بەیەکەوە هەیە تا سروشتی هەڵچونی تەواوەتیمان بداتێ.

کاتێك خوێندکاران سەرنجی مامۆستاکەیان دەدەن لە ناو وانە ووتنەوەدا، ئەوا دەربڕینی ڕوخساری و ناسینەوەی هەڵچونەکان لە دەنگیدا هەست پێدەکەن‌و دەیناسنەوە. لەوەش زیاتر لەبەر ئەوەی یەکەکانی مێشك بەیەکەوە گرێدراون، ئەوا ئاماژەو دربڕینی ڕوخساری مامۆستاکە کاریگەری

دەکاتە سەر جۆری شیکردنەوەیان بۆ دەنگی مامۆستاکەیان( Vroomen, 1999).

هەڵچون پەیوەستە بە جێبەجێکردن لەسەرەوە بۆ خوارەوەو لە خوارەوە بۆ سەرەوە، تۆڕی هەڵچونی بەجۆرێکی چین بە چین ڕێکخراوە زانیاری بۆ هەردو ئاڕاستەکە دەگوێزێتەوە لەسەرەوە بۆ خوارەوەو لە خوارەوە بۆ سەرەوە، گەیاندنی داتاکان لە خوارەوە بۆ سەرەوە ئەوە گەرەنتی دەکات، کە ئێمە وەڵامی هەڵچونیمان بۆ جیهانی دەرەوەمان هەیە. زانیاریەکان لە ئەندامی هەستیەکانەوە وەکو چاو، گوێ دەگوێزرێنەوە بۆ باڵاترین سیستمی چینەکان. کاتێك دەگاتە کۆتایی ڕارەوەکە کە (اللحاء الطرفي) هەست بە پەرچەکرداری هەڵچونیەکە دەکەین.



زۆرجار هەست بە دەموچاوێکی ترسناك دەکەین هەتا ئەگەر زۆریش بۆی بەئاگا نەبین. هەتا پێش ئەوەی دەنگ یان شێوەی بناسینەوە ئەوا ئەندامی

دەماری خۆی پەرچەکرداری جەستەیی هەیە وەکو: دەرهاویشتنی ئەدرینالین، چونەوەیەکی ماسولکەکانو زیادبونی فشاری خوێن. ئەم هەڵچونە نەستیە ڕەنگدانەوەی جۆرێك لە جێبەجێکردنە لە خوارەوە بۆ سەرەوە. زانیاریەکان بەشێوەیەکی کەمتر دەچێت بۆ بەرزترین چین کە کەمێك پێش (اللحاء الطرفي) دەوەستێت. (LeDoux,1998). ئەم جۆرە جێبەجێکردنە گرنگی دەدات بە وەڵامدانەوەی هەڵچونی توند کە لەوانەیە گونجاو بێت یان نەگونجاو بێت بۆ هەڵوێستەکە.

ئەمەش نمونەیەکە بۆ جێبەجێکردنی هەڵچونی لە خوارەوە بۆ سەرەوە:

وای دابنێ لە دارستانێکی نەناسراودا پیاسە دەکەیت، لەپڕ هەستت بە جوڵەیەکی نامۆ کرد، زۆرجار پێش ئەوەی بەئاگابیت بۆ ئەو شتەی هەراسانکارە، چاوت یەکسەر دەچێت بۆ سەرچاوەی دەنگەکەو جەستەت ئامادە دەبێت بۆ هەڵهاتن یان بەرگریکردن. دوای چەند چرکەیەك دەزانیت کە سەرچاوەی دەنگەکە چۆلەکەیەك بووە. وەڵامدانەوە سەرەتاییەکە کە ئامادەکردنی جەستەتە بۆ ڕاکردنو دەستگرتن بەسەرتەوەو خۆپاراستنت ئەوانە هەموی بەشێکە لە غەریزەی خۆپاراستنی خێرا کە لەڕێگەی جێبەجێکردنی لە خوارەوە بۆسەرەوە وەك میراتی بۆمان ماوەتەوە. لەوانەیە چرکەیەکی تەواو تێپەر ببێت هۆشیار بیتو تەواو بەئاگا بیتەوە بۆ سەرچاوەی ترسەکە کە هاوکاتە بۆ شیکردنەوەی سەرچاوەی دەنگەکە تا بڕیار بدەیت کە دەتوانیت چی بکەیت. لەم کاتەدا لەوانەیە بە خۆت پێ بکەنیتو پاشان لە ڕۆیشتن بەردەوام بیت.

بەڵام جێبەجێکردنی لەسەرەوە بۆ خوارەوە یارمەتیمان دەدات تا خۆمان هێمن بکەینەوە بە جۆرەها شێوە: وەکو هەناسەدانو بەئاگاییو بینین سەرکەوتن، بێ پرۆسەی هەڵچونی لەسەرەوە بۆ خوارەوە لەوانەیە لەبەردەم

هەڵچونە توندەکاندا بەهەمو جۆرەکانیەوە لاواز ببین نەتوانین خۆمان کۆنترۆڵ بکەین تا بەردەوام بین لە کارەکەمان. لەوانەیە مامۆستایان بتوانن سود لە پرۆسەی لەسەرەوە بۆ خوارەوە وەربگرن بۆ کەمکردنەوەی هەڵچونە نەرێنیەکان کە لەوانەیە خوێندکار گرێی بدات بە کاری قوتابخانەوە.

## جیاوازی تاکایەتی لە تۆڕی هەڵچونیەکاندا

چۆنیەتی وەڵامدانەوەی کەسەکان لە هەندێك هەڵوێستدا وەکو یەکە. بۆ نمونە زۆربەمان دوای لەدەستدانی کەسێکی ئازیزمان زۆر غەمبار دەبین. لە دەنگێکی بەرز دادەچڵەکین، بەڵام هەمو کەسەکان هەڵچونەکانیان وەك یەك نییە کاتێك بەیەکەوە توشی هەمان ڕوداو دەبین، کەسەکان لە دەربڕینی جۆری هەڵچونەکان ئاستەکەشی جیاوازن. ئەنجامی زۆرێك لە توێژینەوەکان دەریخستوە دەتوانین خەڵك بکەین بەدو پۆلێنەوە ئەوانەی کە بە توندی هەڵچونەکانیان دەردەبڕن ئەوانەش کە بەهێواشی دەریدەبڕن. بە گۆڕانکاری لە دەربڕینی ڕوخساریاندا یان پەرچەکرداری خۆبەخۆیی (Cole. 1996).

ئەگەر بتەوێت پەرچەکرداری هەڵچونی کەسەکان ببینیت بۆ هەلۆێستێك، ئەمجارە کە چویتە کلینیکی پزیشکەوە سەرنج بدە لەوانەی کە دانیشتون‌و چاوەڕوانن بچنە لای پزیشکەکە، هەریەکەیان چۆن لەو چاوەڕوانیەدا دەمێنێتەوە، هەیە زۆر بەپەلەیەو هیچ سەبری نییە، هەیە کەمتر بەپەلەیەو کەسانێکیش هەن کە زۆر بە بێباکیەوە چاوەڕوانن چەندیش دوا بکەون هەر ئارامن.

ئەو کەسانەی کە هەست بە شکست دەکەن ئەوا چالاکیەکی کەم‌و ناتەندروست دەبینرێت لە تۆڕە هەڵچونەیەکانی بەشی لای ڕاستی مێشکیاندا. هەروەها ئەو کەسانەش کە توشی شڵەژانی تۆقین بون چالاکی بەشی ڕاستی مێشکی زۆر سست‌و بێجوڵەیە.



جیاوازی هەڵچونی کاریگەری زۆری هەیە لەسەر پەیوەندی خوێندکار بە خوێندنەکەی‌و پێشکەوتن تیایدا. لە زۆر ڕاهێناندا دەرکەوتوە کە هەڵچونی ئەرێنی بەهێز کاریگەری هەیە لەسەر ئەوانەی توشی کەمتوانی خوێندن بونەتەوە. هاوکاری کردون تا لێهاتویی ناسین‌و ستراتیجی فێربن‌و زاڵ بن

بەسەر بێتواناییەکەیاندا. کێشە هەڵچونیەکان کاریگەری لەسەر پرۆسەی فێربون دەکات بە زۆر شێوە. ئەو خوێندکارانەی توشی شڵەژانی هەڵچونی توند بونەتەوە، کە پەیوەست بێت بە نوشستی سەردەمی منداڵی یان خراپ مامەڵەکردنیان کاری تۆڕی ناسینەوەو ستراتیجی کەم دەکاتەوە (Kenard.2001).

ئەو منداڵانەی کێشەی هەڵچونیان هەیە ئەوا بەئاگاییان زیاتر بۆ ئەو کێشانەیە بە ناگاییو سەرنجیان بۆ وانەکانیان کەم دەبێتەوە. لە لایەکی ترەوە ئەو منداڵانەی کە پێشتر کێشەیان لە فێربوندا هەبوە ئەوا زۆر کۆشش ناکەن بۆ ئەرکی وانەکانیان، هەستە ئەرێنیەکان دەبەستنەوە بە بابەتی دیاریکراوەوە.

تێگەیشتن لە کێشە هەڵچونیەکان لەوانەیە یارمەتی مامۆستاکان بدات بۆ یارمەتیدانی خوێندکارەکانیان زیاترو زیاتر، لە نێو ئەو سێ تۆڕەدا تۆڕی هەڵچونی لە هەمویان گرنگترە زیاتر بنەڕەتیە بۆ فێربوون، بەڵام گرنگی تەواوەتی پێ نادرێت لەڕوی پرۆگرامەکانەوە. هەمو مامۆستایەك هەست بەوە دەکات کە چەندە گرنگە خوێندکار بە پرۆسەی خوێندنەوە پەیوەست بکرێتەوە، یارمەتیان بدرێت تا فێربونیان خۆش بووێت، چێژ لە ڕوبەروبونەوەی زەحمەتیەکانی فێربوون ببینن‌و چۆن زیاتر سور بن لەسەری تا زەحمەتیەکان زیاترو زیاتر دەبێت. (لە کوردستاندا لەبەر هەندێك بارودۆخی ئابوری ئەمانی دامەزراندنی حکومەت بۆ گەنجەکان‌و زۆربونی بێئیشی، ئەمانە تەواو کاریگەریان لەسەر بۆچونی خوێندکارەکان کردوە هەر لەقۆناغە بنەڕەتیەکانەوە، لە مامۆستایەکی قۆناغی حەوتی بنەڕەتیم بیست دەیوت خوێندکارەکان هیچ پاڵنەرو ویست‌و حەزیان بۆ وانەکان نییەو دەڵێن خوێندن بەکەڵکی چی دێت مامۆستا؟ خۆ هەمو

گەنجەکان زانکۆشیان تەواو کردوە بەڵام لەماڵەوە بێکارن. واتە هیچ شتێك لایان خوێندن خۆشەویست ناکات بگرە بەناچاری دەوام دەکەن).

کاتێك سوربونو عەزمیان نامێنێت پەیوەندیان دەپچرێت بە خوێندنەوە، زۆر باشترە ئەگەر ئەم کێشەیە لە دەرەوەی وانە ووتنەوەو خوێندن چارەسەر بکرێت. کاتێك باس لە پێداویستی خوێندکار دەکرێتەوە لایەنە هەڵچونیەکانی لەبەرچاو بگیرێت وەکو ڕەگەزێکی گرنگی پەیوەست بە خوێندنەوە، لەوانەیە زۆر کاریگەری لەسەر کاراکردنی پرۆسەی خوێندنو فێربون بکات. سەیری ئەم جیاوازیانە بکە: هەندێك خوێندکار حەزیان لەوەیە کە لەشوێنی ئارام و هێمندا بخوێننەوە.هەندێکی تر تا دەنگە دەنگ هەبێت لای خۆشەو زۆر ئاسایی دەخوێنێتەوە. هەندێکی تر پێی خۆشە چیرۆکێك چەند جار بخوێنێتەوە، هەندێکی تر لە دوبارە خوێندنەوەی چیرۆکێك بێزار دەبێت. هەندێك خوێندکار لای خۆشە یەکێك پێی بڵێ کە کام کتێب بخوێنێتەوە. هەندێکیش لە سەربەخۆیی بڕیارداندا گەشە دەکاتو پێشدەکەوێت. ئەمە جگە لەوەی کە ناوەڕۆکی بابەتی خوێندنەوە دەگۆڕێت لای کەسەکان.

هەڵچونە ئەرێنیەکان یارمەتی هانداٰنو پاڵپشتکردنی خوێندکار دەکات لە فێربوندا هەروەکو چۆن هەڵچونی نەرێنی دەبێتە ڕێگر بۆ فێربونی. لەوانەیە بنەمای زۆرێك لە کێشەو زەحمەتیەکانی فێربون بابەتی هەڵچونەکان بێتو هەر لە ڕێگەی ئەویشەوە چارەسەر بکرێت. سەیری ئەم نمونەیە بکەن:

مامۆستایەکی پۆلی چوارەم خوێندکارێکی هەیە کە ناوی (سیروان)ە، زۆر کێشەی هەڵچونی هەیە. سیروان لەپۆلە سەرەتاییەکاندا کێشەی هەبوو لە بابەتی خوێندنەوەو بیرکاریدا. بە پاڵپشتی خێزانەکەی گۆڕانکاری لە



ئەرکەکانی ماڵەوەیدا توانراوە کە زۆر پێش بکەوێت. دوای ئەوە گۆڕانکاری لە دۆخی خێزانەکەیدا ڕویداوەو دایك‌و باوکی لەیەکتر جیا بونەتەوە، ئەوەش وای لێ کردوە کە تەرکیزی بڵاو بێتەوە لە پۆلداو ئاستی فێربونی بەرەو دواوە بڕوات. مامۆستاکان درکیان بەمە کردوە ئەوەشیان گەڕانۆتەوە بۆ کێشەکانی خێزانەکەی.

مامۆستای هونەر سەرنجی ئەوەی داوە کە سیروان هەمو تەریکزی خۆی خستۆتە سەر بابەتی وێنە کێشان‌و زۆر بە وردەکاریەوە وێنەکانی دەکێشێت. هەر لەمەوە ویستیان پلانێکی بۆ دابنێن چۆن لە ڕێگەی وێنە کێشانەوە حەماس‌و جۆشی بۆ وانەکانی تریش بگەڕێننەوە.

توێژنەوەکانی مێشك دەریانخستوە کە ئەو پێوەرەی خوێندکارانی پێ پۆلێن دەکرێت بۆ (زیرەك‌و دواکوتوو کەمتواناو بە توانا ئاسایی‌و نائاسایی..هتد)، ئەم پۆلێنانە هەموو ڕاستیەکان نییە ئەوە سادە کردنەوەیە،



ڕەنگدانەوەی ڕاستی نییە، کاتێك ئەم پۆلێنە دەکەن زۆرێك لە وزەو تواناو سیفاتە باشەکانی خوێندکار لەدەست دەدەین، چونکە تەنها کۆبیرمان خستۆتە سەر یەك سیفەت.

ڕێکخستنی تۆڕەکانی فێربون لە یەکەو پرۆسەی پسپۆری زۆر ورد لە ڕیگەی تۆڕەکانەوە، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەر خوێندکارێك دێت بۆ قوتابخانە خاوەنی خاڵی ئەرێنیو بەهێزو خاڵی ئەرێینیو لاوازیشە، شتی تایبەت بە خۆی هەیە. خاڵی لاوازیو بەهێزی هەر سێ تۆڕەکە کارلێك لەگەڵ ژینگەی فێربونو فێرکاریدا دەکات بەجۆرێك یان دەبێتە هۆی پێشکەوتنی یان دەبێتە هۆی دواکەوتنی. زۆر جار یەك کێشە هەموو سەرنجەکان بۆ لای خۆی ڕادەکێشتو لەسەر حسابی پشگوێخستنی کێشەکانی تر. بۆ نمونە ئەو خوێندکارانەی زەحمەتیەکانی فێربونیان هەیە تەنها وا دەزانرێت کە کێشەیان لە ناسینەوەی پیتو وشەکاندا هەیە. لە کاتێکدا زۆربەی زەحمەتیەکانی فێربون بەندە بە هەر سێ تۆڕەکەوە.

ئەو بیرۆکە تازانەی کە پەیوەستە بە چۆنیەتی فێربونی مێشك یارمەتی مامۆستا دەدات بۆ تێگەیشتن لە جیاوازی نێوان خوێندکارەکان. بیرۆکەی ئەوەشمان لا دروست دەکات کە خوێندکارەکان چۆن دەتوانن باشتر بەرەو پێشەوە بڕۆن لە فێربوندا. وەك لەم نمونەیەدا ڕونی دەکەینەوە:

شیرکۆ خوێندکاری پۆلی شەشەمی سەرەتاییو کوڕێکی زۆر بەئەدەبە. تۆماری خوێندنگەکەی ئاماژە بەوە دەکات کە پێشوتر دایسلیسیای (زەحمەتی لە خوێندنەوەدا) هەبوە سەرباری ئەو ڕاهێنانو وانە زیادانەی کە پێی دەدرێت هێشتا ئەو کێشەیەی چارەسەر نەبووە.

مامۆستاکەی لە هەفتەکانی سەرەتادا هەولیدا کە خالی بەهێزو لاوازی شێرکۆ بناسێت لە ڕێگەی هەر سێ تۆڕەکەوە. مامۆستاکەی هەستی بەوە کرد کە کێشەکانی شێرکۆ زۆر لەوە ئالۆزترە کە لە پلانی چارەسەریەکەیدا ئاماژەی بۆ کراوە. سەرباری کێشەی ناسینەوەی پیتو وشەکان، شیرکۆ کێشەی تری ستراتیجی هەیە وەکو ئەوەی کە زۆر زوو ئاگایی بڵاو دەبێتەوەو زۆر لای قورسە خۆی کۆنترۆڵ بکات. ئەمەش وای لێدەکات زوو لە ئامانجەکەی دور بکەوێتەوە لەنیوەی چالاکیەکدا کە ئەنجامی دەدا. لەگەڵ ئەوەشدا مامۆستاکەی هەستی بەوە دەکرد کە شێرکۆ دڵخۆشە بەشێوەیەکی گشتی، ئەو لەسەر دەرنەچوونو شکست ڕاهاتووە. کەسێتیەکەی لاواز دەردەکەوێت. جارناجارێك خۆی نوکتە لەسەر نمرە نزمەکانی دەکات وەکو ئەوەی شانازی پێوە بکات، وا دیارە ئەو نایەوێت هەولێك بۆ گۆڕینی ئەو دۆخەی خۆی بدات. ئەم کێشانە بە ڕونی نیشانەیە بۆ کێشەی هەڵچونیو سۆزداری کە دەبێت چارەسەر بکرێت. مامۆستا دەزانێت باشترین ڕێگای چارەسەری تێگەیشتنە لە خالی لاوازیو بەهێزی ئەو. سەرەتا لە کێشە هەڵچونەکەیەوە کە دەبێت بزانێت ئەو هیچ بەجۆش نییە بۆ خوێندنو گرنگی بە نمرەو

دەرچون نادات. بۆیە پێشکەوتنی لەسەر ئاستەکانی تری وەکو ناسینەوە لایەنی ستراتیجی پێشناکەوێت. مامۆستاکەی بڕیای دا کە خاڵی بەهێزی شێرکۆ وەکو ئەوەی حەزی لە وەرزشی تۆپی ڤالیبۆڵە ویستی ئەو حەزەی بەکاربهێنێت بۆ هەندێك لە ئەرکەکانی قوتابخانە بۆ نوسینو بیرکاری وای بۆی داڕێژێت کە لەسەر ئەو وەرزشە بنوسێتو پرسیارەکانی بیرکایش ببەستێتەوە بەو وەرزشەوە بەجۆرێك کە خاڵە لاوازەکانی نەبنەوە ڕێگر لەبەردەمیداو بتوانێت ئەرکەکانی بەباشی ئەنجام بدات. بۆیە پێویستە مامۆستایان زانیاری ورد لەسەر خوێندکارەکانیان بەدەست بخەنو بگەڕینەوە بۆ ئەو کەرەستەو ئامڕازانەی هەیانە لەناو پۆلەکاندا.

## بەشی حەوتەم

- لێهـاتویی مامەڵـەکردن لەگـەڵا جیـاوازی تاکەیـەتی لەلایـەن مامۆستاوە
- ڕێوشوێنی مامەڵەکردن لەگەڵ جۆری کەسێتی خوێندکارانـدا: هەموو پۆلێك چوار جۆر خوێندکاری تیادایە:

# لێهاتویی مامەڵەکردن
# لەگەڵ جیاوازی تاکەیەتی لەلایەن مامۆستاوە

مامۆستا ڕەگەزێکی پێویستە بۆ جێبەجێکردنی هەر پلانێك کە ڕەچاوی جیاوازی تاکەیەتی نێوان خوێندکارەکان دەکات، لە پرۆسەی خوێندندا پێویستمان بەو مامۆستایانە هەیە کە گرنگی جیاوازی تاکەیەتی هەست پێدەکەن، دەتوانن پرۆگرامی خوێندن لەگەڵ ئەو جیاوازیانەدا بگونجێنن، ئەمە جگە لەوەی زۆر زیاتر پێویستمان بەو مامۆستایانە هەیە کە بونی جیاوازی تاکایەتی نێوان خوێندکارەکان بەشتێکی سروشتیو پێویست دەزانن، چونکە ئێمە ئەگەر وای دابنێین کە خوێندکارەکان لە ڕوی توانای عەقڵیو جەستەییو هەڵچونیەوە وەکو یەك هاوشێوەو یەکسانن ئەوە پیادەکردنی پرنسیپی یەکسانیو دادەوەری نییە، بگرە ئەوە پێشێلکردنی پرنسیپی یەکسانیەو زوڵم کردنە لێیان.

مامۆستا بە گشتی لەناو پۆلەکاندا ڕوبەڕوی کێشەی جیاوازی تاکایەتی دەبنەوە، لە زۆربەی قۆناغەکاندا. لەبەر ئەوەی خوێندکاران لە ڕەفتارو توانا هەڵچونیو عەقڵیاندا جیاوازیان هەیە، کەواتە دەرکەوتنی کێشە لە قونابخانەکاندا بەهۆی ئەم جیاوازیانەوە شتێکی سروشتیە. دیارە دەرونناسی جیاوازی تاکایەتی ڕێو شوێنی چۆنیەتی مامەڵەکردنی ئەم جیاوازیانە پێشکەش دەکات نەك لابردنی و نەهێشتنی. چونکە بیرکردنەوە لە لابردنو

نەهێشتنی شتێکی مەحاڵە. هەوڵەکانی ئەم زانستە بۆ ئەوەیە کە بۆشایی نێوان توێژە زۆر جیاوازەکان کەم بکاتەوە، ئەویش بە ڕێنماییو هاوکاری کردنی توێژە زۆر لاوازەکان ئەویش بۆ ئەوەی ئەگەر کەمێکیش بێت لە توێژەکەی تر نزیکی بکاتەوە. ئەو ڕێگریانەی لە بەردەمی ئەم توێژە لاوازانەدا هەیە کە ناهێڵێت گەشە بکەنو پێش بکەون لەوانەیە هۆکاری ژینگەیی بێت، کە دەکرێت کاری لەسەر بکرێتو زاڵ ببین بەسەریدا یان لەکاریگەریەکەی کەم بکەینەوە. دەروونناسانو پەروەردەکاران هەندێك ڕێو شێوازی وانە ووتنەوەی جۆراو جۆریان داهێناوە، چونکە بەکارهێنانی تەنها یەك شێوازی فێرکاری بۆ خوێندکاران مەحاڵە ئەنجامی باشی لێبکەوێتەوە. ئەوەی پێویستە هەموو مامۆستایەك جیاوازی تاکایەتی خوێندکارەکانی لە ڕوی دەرونیو عەقڵیو هەڵچونیەوە بناسێتو لە کاتی دانانی پلانی وانە ووتنەوەدا لەبەرچاوی بگرێت.



مامۆستا لەیەك وانەدا بەچەند ئاستێکی جیاواز وانەکەی بڵێتەوە. لەوانەیە وا پێویست بکات کە پۆلەکەی دابەش بکات بۆ گروپی هاوشێوە و لەیەك نزیك لە تواناو ئامادەباشیدا. واتە بە هەر یەکێك لەو گروپانە بە پێی ئاستی تواناو ئامادە باشیەکانیان وانە بڵێتەوە.

ئامادەکردنی مامۆستا بۆ ئەوەی بتوانێت مامەڵەی جیاوازی تاکایەتی خوێندکارەکانی بکات زۆر گرنگو پێویستە، چونکە لابردنی جیاوازیەکان شتێکی مەحاڵە، بۆیە ئەوەی دەمێنێتەوە لەبەردەمی مامۆستادا ئەوەیە کە

چۆن مامەڵەی هەر ئاستێك لەم ئاستانە بکاتو بەو شێوازە وانەی پێ بڵێتەوە کە لەگەڵ تواناو ئامادەباشیاندا گونجاو بێت.لە جیهانی ئێستادا یەکێکە لەپرنسیپە مرۆڤایەتیەکان ئەوەیە کە خوێندن مافێکی بنەڕەتی هەموو مرۆڤێکە لە هەمو ئاستو پلەیەکی کۆمەڵایەتیدا بێت. بۆچونە پەروەردەییەکان بەو ئاراستەیەدا دەچن کە ئازادی بدرێت بە فێرخواز چی دەوێت ئەوە فێر ببێتو ئەو بوارە هەڵبژێرێت بۆ خوێندن کە حەزی لێیەتی، چونکە لەو بوارەدا پاڵنەری زیاترەو زیاتریش فێربون بەدەست دەخات، ئەمەش بۆتە یەکێك لە پرنسیپەکانی پەروەردە تا ئامانجی فێربون تەنها لە لەبەرکردنو بەیادهێنانەوە سنوردار نەکات، بۆ نمونە زۆرێك لە خوێندکارەکانمان بابەتەکانی دواناوەندی هەتاکو زانکۆشیان بیر نامێنێت دوای سێ چوار ساڵ لە دەرچونیان، چونکە یان مەیلیان لێ نەبوە، هیچ کامیش لەو بابەتانە لە ژیانی خۆیاندا بەکارناهێنن. بۆیە ئێستا دروشمی پەروەردە بوە بە **فێربونی بەردەوامی تاکەکەس بەدرێژایی ژیانی لەگەڵ خۆفێرکردن بۆ بەدیهێنانی زیاترین داهێنان.** ئێستا خوێندکار ناتوانێت بەو هێندە زانیاریەی کە لە قوتابخانەو زانکۆکاندا وەریدەگرێت بەس بێت بۆی، پێویستە هەمیشە بەدوادا چونی هەبێت بۆ پێشکەوتنە تازەکانی زانستو زنیاری(ئەبدەیتی زانیاریەکانی بکات). ئەم ئامانجەش بەچی بەدەست دێت؟ ئەگەر پەروەردە پشت بە پرنسیپی خۆفێرکردنو پیادەکردنی پرنسیپی خوێندکار مافی ئەوەی هەبێت کە بەو شێوەیەی لەگەڵ تواناکانیدا گونجاوە فێر بکرێت. ئەگەر بەو شێوەیە نەبێت ناتوانین ڕوبەڕوی ئەو تەوژمە لە لافاوی زانیاریەکانی هەیە، ببینەوە.

ئێستا ژمارەی دانیشتوانی جیهان زۆر بەخێرایی زیاد دەبێت، بەو پێیەش ژمارەی فێرخوازان هەر لەزیادبوندایە، ژمارەی زۆری خوێندکاران هۆکاری زیاتر دەرکەوتن و فراوان بونی جیاوازی تاکایەتیە لە ئاراستەو توانا عەقڵیەکان و لە شێوازی بیرکردنەوەو فێربون و هەر خوێندکارێك پاڵنەرو توانای تایبەت بەخۆی هەیە، بەشێوازی تایبەت بە خۆی فێردەبێت، کە پێویستە لەکاتی فێرکردنیدا لەبەرچاو بگیرێت.

لە قوتابخانەکاندا مامۆستا بەو شێوازە کلاسیکیەی وانە وتنەوە نەیتوانیوە مامەڵەی جیاوازی تاکایەتی بکات ئەوەش ماوەی نێوان توێژی خوێندکارانی زیاتر کردووە جیاوازیەکانی فراوانترو جۆراوجۆرتر کردووە. ئەمەش لێهاتوویی فێرکاری نزم کردۆتەوە، لە کۆنگرەی پەروەردەیی لە قاهرە لەساڵی(٢٠٠٠)دا ئاماژە بەوە کراوە کە ئاستی فێرکاری لە زۆربەی وڵاتە عەرەبیەکاندا هاتۆتە خوارەوە، کوالیتی خوێندن زۆر دابەزیوە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ناوەڕۆکی خوێندن زۆر دورە لە ژیانی فعلی خوێندکارانەوە، وانە ووتنەوەش هەر ڕێگا کلاسیکیەکەیە و پشت بە ووتنەوەو لەبەرکردن دەبەستێت و دورە لە داهێنان و



مەعریفەوە. ئەمە جگە لەوەی لەدوای هاتنی ڤایرۆسی کۆڤید نۆزدەوە و داخراوی دەرگای قوتابخانەکان ئەو کێشانەی زۆر زیاتر کردوە و ئاستی خوێندکارانی هێندەی تر هێناوەتە خوارەوە.

لێرەوە گۆڕینی شێوازی وانە ووتنەوە پێویستیەکی هەنوکەییە بۆ ئامانجی گەشەی هەمەلایەنەی خوێندکار. پشتبەستن بە ستراتیجی تازە وەکو شێوازەکانی خۆفێرکردن و جۆراو جۆری شێوازی وانە ووتنەوە زۆر گرنگە. کەواتە دروشمی پەروەردە پێویستە لە ئێستادا ئەمە بێت" فێرخواز ببێتە سەنتەری پرۆسەی فێرکاریو بەکارهێنانی جۆراو جۆری لە وانەوتنەوەدا لەگەڵ هاندان و پاڵپشتکردنی خۆ فێرکردن و فێربونی بەردەوام".

بەلام کێشەکە لەوەدایە کە ئێمە لە قوتابخانەکانماندا وا ئامادە نەکراوین، کە مامەڵە لەگەڵ جیاوازی تاکایەتی بکەین. منداڵانی پۆلی یەکەمی بنەڕەتی هەمویان لە هەمان تەمەندانو یەك پەڕاوی پرۆگرامیان بۆ دانراوەو بە هەمان پلانو بەهەمان شێواز وانەیان پێدەڵێینەوە. زۆر پێویستە لە ڕێگەی شێوازە جیاوازەکانی وانە ووتنەوە مامۆستا بتوانێت ڕەچاوی جیاوازی تاکەیەتی بکات. ئەگەر هەر ڕێگایەك بەکار دەهێنرێت گرنگ ئەوەیە کەهەمو خوێندکارەکان بەشداری وانەکەیان پێ بکرێت نەك تەرکیز مامۆستا بچێتە سەر چەند خوێندکارێکی زیرەك و ئەوانی تریش پشت گوێ بخرێن. پرسیاری تاقیکردنەوەکانیش پێویستە لە ئاسانەوە تا مام ناوەندیو تا قورسیشی تیا بێت.هەروەها زیاتر پاداشتی ئەو خوێندکارانە بکرێت کە نمرەکانیان کەمەو هەوڵێکی ئەگەر کەمیش بدەن ئەگەر یەك نمرەش بەرز بکەنەوە ئەوا زۆر دەستخۆشیان لێبکرێت. جێی دانیشتنیان بهێنرێنە پێشەوە نزیك مامۆستا. مامۆستا بە دەنگێکی ڕوون و ئاشکرا و بەرز وانە رونبکاتەوە لە پۆلدا. کاتێك لەسەر وایت بۆرد دەنوسێت با دەستوخەتی ڕون و ئاشکرا بێت بۆ خوێندکارەکان. مامۆستا بەردەوام تیانوسی بۆ بەدواداچونی چالاکی و بەشداری خوێندکارەکان هەبێت. هەمیشە چالاکیان بۆ ئامادە بکات کە جۆرێك لە ڕوبەروبونوەی تیا بێت(واتە گران و قورس بێت) بۆ هاندانو

خۆبەروپێشەوە بردن بەتایبەت بۆ زیرەکەکان. لە هەمان کاتدا ئاگای لەو خوێندکارانە بێت کە فێربونیان هێواشە دەبێت بەسۆزو بەسەبر بێت لەگەڵیاندا ئەوانە درەنگ تێدەگەن، بەڵام **هێواش فێربوون نیشانە نییە بۆئەوەی کە تێناگەن یان ئاستی زیرەکیان نزمە.**

جۆرێك لە شێوازانەی وانە ووتنەوە بەکاربهێنێت کە بگونجێت لەگەڵ جیاوازی توانای خوێندکارەکان. ئەمە جگە لە گونجاندنی ژینگەی قوتابخانە لەگەڵ ئەو شێوازی وانە ووتنەوانەی کە گرنگی بە جیاوازی تاکایەتی دەدات. هەندێك لەو شێوازی وانەوتنەوانەی کە تا ئێستا بەکار هێنراون ئەمانەی لای خوارەوەن:

١. **شێوازی ئەو گروپانەی کە خاوەنی توانای وەك یەكو هاوشێوەن:** لە ئەمریکاو لە هەندێك وڵاتانی ئەوروپا بەمەبەستەوە خوێندکاران لەسەر بنەمای هاوشێوەیی توانای عەقڵیان دابەشکردوە. لەم شێوازەدا خوێندکارە هاوشێوەکان لە توانای زهنیو عەقڵیدا لەیەك گروپدا ڕێکخستووە. ئەم شێوازە ڕوبەروی زۆر ڕەخنە بۆتەوە لەو ڕوانگەیەوە، کە ئەم شێوازە دەبێتە هۆکار بۆ ئەوەی خوێندکارەکانی تر هەست بە کەموکورتی خۆیان بکەن کاتێك ئەم خوێندکارە زیرەکانە جیادەکەنەوە لێیان. بەمەش کاریگەری لەسەر وێنایان بۆ خودی خۆیان بەنەرێنی دروست دەبێت، هەروەها ئەم ڕێگایە خوێندکارە ئاساییەکان لە تواناو ئەزمونی خوێندکارە زیرەکەکان بێبەش دەکات.

٢. **شێوازی هەرەمەکی:** لەم شێوازەدا گروپەکان بە شێوەیەك ڕێکدەخەن کە خاوەنی توانا عەقڵیە جیاوازەکان بەیەکەوە لە گروپێکدا بن بەمەبەستی ڕوبەروبونەوەی جیاوازی تاکایەتی، ئەویش بە هەڵبژاردنی ئەو شێوازانەی وانەووتنەوە، کە تیایدا ڕەچاوی تواناو ئامادەکارییە جیاوازەکان بکات، ئەم

شێوازەش زۆر ڕەخنە كراوە، چونكە زۆرجار لەم شێوازەدا مندالە بەتواناكان زەرمر دەكەنو ئەوان لەوانەیە توشی بێزاری ببنو نەتوانن تەواوی هەوڵی خۆیان بۆ فێربون بدەن.

٣. **شێوازی فێركردنی بە كۆمەڵ:** لەم شێوازەدا پشت بە دو مامۆستا یان زیاتر دەبەسترێت بۆ وتنەوەی وانەكە، كە پلان و شیوازی وانەووتنەوە لەلایەن هەردوكیانەوە هەڵدەبژێرێت، ئەم شێوازە دەكرێت لە قۆناغی بنەڕەتیو دواناوەندیشدا بەكار بهێنرێت. هەر مامۆستایەك بەرپرس دەبێت لە وتنەوەی بەشێك لە بەشەكانی بابەتی وانەكەو باشتریشە ئەگەر ڕێنمایكارێكی پەروەردەیشیان لەگەڵدا بێت. ئەم شێوازە لەزۆر وڵاتان پەیڕەو كراوە، بەڵام پێویستی بەمامۆستای ئامادەكراو هەیە لەگەڵ پرۆگرامی گونجاو بەو شێوازە وانە ووتنەویە.

ئەو شێوازی وانە ووتنەوانەی كە لایەن زانایانی پەروەردەوە پێشنیار كراوە تا بەهۆیەوە بتوانن جیاوازی تاكایەتی خوێندكاران لەبەر چاو بگرن ئەمانەی لای خوارەوەیە

یەكەم: نمونەی كلاسیكی كە دونمونە دەگرێتەوە:

ا. فێركردنی تاكەكەسی بۆ زیاتر قوڵبونەوەو دەوڵەمەند كردن.

ب. فێركردنی تاكەكەسی بۆ خێراكردن.

دووەم: فێركردنی (بەوردەكاری و سەنجەوە كار ئەنجام بدات[١٣])كە بەگشتی پشت بە تیۆری ڕەفتاریەكان دەبەستێت، بەتایبەتیش تیۆری بلوم.

سێهەم: نمونەی وانە وتنەوەی بە پرۆگرام. ئەمەش پشت بە جێبەجێكردنی پرنسیپی فێربونی كرداری (سكنەر)دەبەستێت لە وانە ووتنەوەدا. لەگەڵ سیستمی وانە وتنەوەی تاكەكەسی (كیلەرKeeler).وەكو

[13] اتقاني

هەوڵێك بۆ ڕزگاربوون لە وانە ووتنەوەی کلاسیکیو کۆن، کە پشت بە کتێبی پرۆگرامی دانراو لەلایەن وەزارەتی پەروەردەو ووتنەوەی محازەرە دەبەستێت.

لەگەڵ تەواو کردنی پرۆگرامەکەو ڕونکردنەوەی بەپێی توانای خوێندکارەکان بێت، تەنها سنوردار نەکردنی بابەتەکانی خوێندن لەچوارچێوەی یەك کتێبدا. خوێندکارە سەرکەوتوەکان یارمەتی خوێندکارە کەمتواناکان بدەن. کیلەر باوەڕی وایە کە ئەم شێوازە بۆشایی نێوان توێژەکانی خوێندکار واتە جیاوازی تاکایەتی کەم دەکاتەوە.

لێرەوەیە کە لە چوارچێوەی پرنسیپی پەروەردەی نوێدا ڕەچاوکردنی جیاوازی تاکایەتی زۆر گرنگە ئەرکەکەش زیاتر لەسەر مامۆستایە. ئەم پرۆسەیە یارمەی زۆر شت دەدات لە پرۆسەی فێرکاریو فێربوندا تا یارمەتی فێربونی هەموو ئاستەکان بدات ئەمەش لەکۆتاییدا بەرهەمی فێرکاری زۆر زیاتر دەکات(واتە ژمارەیەکی زۆری خوێندکاران دەردەچنو دەبنە خاوەن بڕوانامەی خۆیان) و لە بەفیرۆچونی هەوڵەکانی فێرکاری کەم دەکاتەوە تا ڕادەیەك خوێندکاران دەگەیەنێتە ئاستی پێویست، سەرباری ئەوەی کە پێداویستیە جیاوازەکانی زۆربەی خوێندکارانی یەك پۆل دابین دەکات.

کۆمەڵێك ڕێنمایی بۆ مامۆستا تا لێهاتوو بێت لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسێتی جیاوازی خوێندکارەکاندا.

١. فرەچەشنی لە شێوازی ڕاهێناندا وەکو (وتووێژ، ڕۆڵبینین، چارەسەری کێشە، شالاّوی زهنی).
٢. مامۆستا لەگەڵ ڕونکردنەوەی بابەتی وانەکەیدا نمونەی واقعی کە لە ژیانی خوێندکارەکەوە هەڵهێنجرابێت، بهێنێتەوە، بوار بدات بە

خوێندکارەکان با نمونە لە سەر ژیانی خۆیان بهێننەوە تا باشتر تێبگەن.

٣. زۆر شێواز بەکاربهێنە کە خزمەتی ناوازەیی‌و بێوێنەیی شێوازی فێربوونی خوێندکارەکان بکات وەکو(دروستکردنی ڕۆژنامەی کارەکان، بەکارهێنانی کارتی فێرکاری وەکو کارتی دەربڕین و ئامازەکان، کارتی بیرکردنەوە، کارتی ڕێنماییەکان، کارتی ڕاهێنان، کارتی ڕاستکردنەوە).
٤. جوڵەی مامۆستا لە پۆلدا بەشێوەیەکی گونجاو بێت، تەنها لە شوێنکدا نەوەستێت کە ئەوە دەبێتە هۆی بێزاری خوێندکاران.
٥. مامۆستای لێهاتوو هەر سێ جۆری کارلێك بەکادەهێنێت لەناو پۆلدا ئەویش کارلێکی مامۆستاو خوێندکارو کارلێکی خوێندکارو مامۆستا، کارلێکی خوێندکارو خوێندکارە.
٦.بێدەنگی؛ لە کۆندا چەند ساتێك بێدەنگی لەلایەن وتارخوێنەکانەوە بەکاردەهات بۆ زیاتر سەرنجراکێشی ئەو بابەتەو، ڕاکێشانی بەئاگایی بیستەرانی، بەڵام هێشتا لە وانە ووتنەوەدا زۆر تەرکیزی نەخراوەتە سەرو توێژینەوەی لەسەر نەکراوە، زۆربەی مامۆستاکانیش بەهیچ شێوەیەك لە قسەکردن ناوەستن وا دەزانن بەوە دەتوانن بەردەوام کۆنترۆڵی پۆلیان لەدەستدا بێت، بەڵام بۆ زیاتر بەدیهێنانی فێربونی کارا بەکارهێنانی چەند ساتێکی بێدەنگی لەناو پۆلدا شتێکی باشە.
٧. هاندانی خوێندکاران‌و بەرزکردنەوەی پاڵنەری ناوەکیان بۆ خوێندن‌و خوێندنەوە.
٨. یارمەتیان بدات بۆ دارشتنی ئامانجی گونجاو بە خۆیان‌و چۆنیەتی بەدیهێنانی.

١٠. لەکاتی وانە ووتنەوەدا شێوازی سەرنجراکێش‌و وروژێنەریان بۆ بەکاربهێنێت ئەویش بەبەکارهێنانی کەرەستەی وانە ووتنەوەی جۆراو جۆری کە هەمو هەستەکان بوروژێنێت وەکو هەستی (بنینی‌و بیستنی‌و دەستلێدان...هتد). توێژینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە(٧٠٪)کاتی وانەکان مامۆستا هەر قسە دەکات. واتە تەنیا هەستی بیستن بەکار دێت لەلایەن خوێندکارانەوە، بۆیە بەکارهێنانی هەستەکانی تر لە کاتی وانەکاندا سەرنجراکێشی‌و بەئاگای خوێندکاران باشتر دەکات.

١١. مامۆستا ڕۆڵی سەرەکی هەیە لە دروست کردنی کەشێکی شیاوی فێربون لە وانەکاندا، رەفتاری مامۆستا وا دەکات کە ببێتە ڕابەر بۆ خوێندکارەکانی، دەتوانێت بەشێوەیەك وەها پاداشت‌و سزا بەکاربهێنێت، کە بکەوێتە خزمەتی ئامانجی پرۆسەی فێربون‌و پەروەردەوە. بەکارهێنانی پاداشتی جۆراو جۆر. یەکسەر دوای ئەنجامدانی کارەکە بێت. چونکە ئەوە کاریگەری تەنیا بۆ ئەو خوێندکارە نییە کە پاداشت کراوە بگرە کاریگەری لەسەرجەم خوێندکارەکانی تر دەکات.

١٢. خۆی دور بخاتەوە لە بەکارهێنانی ناو ناتۆرەی نەشیاو ناشرین بۆ ئەوەی خۆشەویستی فێربون‌و خوێندن لای خوێندکارەکان سارد نەکاتەوەو لاوازی نەکات.

١٣. ڕۆحی کێبرکێ شیاو لە نێوانیاندا دروست بکات‌و لەگەڵ ئەو خوێندکارانەی کە توانایان لاوازە زیاتر هانیان بدات‌و بیخاتە ناو ڕوبەروبونەوەی گونجاو لەگەڵ تواناو ئامادەییان. با وایان لێبکات کە خوێندکاری کەم توانا کێبرکی لەگەڵ خوێندکاری بەتوانا بکات و پێ

بلێ تۆ دەتوانیت ئەوە بکەیتو سەرکەوتوبیت، بە خوێندکار بەتواناکانیش بڵێت تۆ دەتوانیت لەوە باشتر بیت کە ئێستا هەیت با بکەوێتە کێبرکێوە لەگەڵ بەتواناترین خوێندکاردا. ئەمەش بە جۆرێك ئەنجام بدات کە گەشەی لایەنی کەسێتیان باشتر بکات. نەك توشی خۆپەرستی ئەنانێتیان بکات. پێویستە لەم کێبرکێکاریانەدا خوێندکار چێژی لێوەربگرێت نەك ببێتە مایەی غەم و خەفەت و دڵەراوکێ بۆی.

١٤. چاودێری ئاستی دەستکەوتی خوێندکارەکان بکات (نمرەکانیان) لەکاتی تاقیکردنەوەکاندا پرسیارەکان گونجاو بێت بۆ خوێندکارە بەتواناکانو پرسیاریشی تیادا بێت بۆ خوێندکارانی کەم توانا.

١٥. چالاکیو ووزەی خوێندکارەکان بەکاربهێنێت بۆ پەرەپێدانی ئاستی تێگەیشتنو فێربونیان لە ڕێگەی بە کرداری کردنی ئەو زانیاریانەی کە فێری بوون. جێبەجێکردنی لە هەڵوێستی جیاواز جیاوازدا.

١٦. دابین کردنی کەشێکی سۆزداریو کۆمەڵایەتی گونجاو لە نێوان مامۆستاو خوێندکارەکاندا، هەروەها لە نێوان خوێندکارەکان خۆشیاندا، چونکە بەتوێژینەوە دەرکەوتوە کە باشی ئەو پەیوەندیانە کاریگەری دەکاتە سەر ئاستی فێربونو دەستکەوتی خوێندنی خوێندکارکانیش.

١٧. دەبێت پرگرامێکی وەها بونیات بنرێت تا ڕەچاوی جیاوازی نێوان خوێندکارەکان بکات. ئەوکاتە زیادە ڕەوی ناکەین، ئەگەر لە هەمو لایەنێکەوە سەیری خوێندکارەکان بکەین: چۆن بیردەکاتەوە، چۆن ڕەفتار دەنوێنێت؟ چۆن فێردەبێت؟ ئەو بەهاو ئاکارانەی پەیرەوی دەکات چییە؟ ئەو لێهاتوییانە چییە کە دەبێت وەریبگرێت؟ هەمو

ئەم لایەنانە دەبێت لە ناوەڕۆكی پرۆگرامەكەدا بونی هەبێت، نابێت ناوەڕۆكی بابەتەكان تەنیا هەندێك ڕاستی زانستی بێتو بەس، بەڵكو كۆكراوەیەك بێت لە هەمو لایەنەكانی خوێندكار؛ تواناكانی پاڵنەرەكانی ویستو خولیاكانی.

١٨. هاندانی كاركردنی بە گروپ بەتایبەت لەكاتی پشوی هاویندا، ئەمەش هاوكارە بۆ باشتركردنی پەیوەندی كۆمەڵایەتی نێوانیان. یان بۆ ناو پۆل گروپی ڕونكردنەوەی وانە بۆ یەكتر دروست بكات، چونكە هەندێكجار ڕونكردنەوەی خوێندكارێك بۆ خوێندكارەكانی تر لەوانەیە باشتر بێت لە ڕونكردنەوەكانی مامۆستاكەی.

## ڕێوشوێنی مامەڵەكردن لەگەڵ جۆری كەسێتی خوێندكاراندا : هەموو پۆلێك چوار جۆر خوێندكاری تیادایە :

- ئەوانەی بۆ فێربوون هاتوون: ئەو خوێندكارەیە كە ئامانج لە هاتنی بۆ قوتابخانە بۆ فێربوونە.
- ئەوانەی كە هاتوون بۆ بەسەربردنی كاتی خۆشو پێكەنین: ئەو خوێندكارانەن كە هاتون تەنها كات بەرنە سەر بەپێكەنین و یاریكردن لەگەڵ هاوڕێكانیاندا.
- ئەوانەی كە بە زۆرو ناچاری دێن بۆ قوتابخانە. ئەو خوێندكارانەن كە بە زۆر دەنێرێن بۆ قوتابخانە لە لایەن باوانەو ئەو خۆی هیچ حەزی لە قوتابخانە نییە، زۆرجار ئەم جۆرە خوێندكارانەن كە كێشە دروست دەكەن.
- ئەوانەی هاتوون تەنها دەربچن و قوتابخانە تەواو بكەن و ئامانجیان فێربوون نییە تەنها بڕاوانامەكەیان دەوێت: ئەم جۆرە لەم دواییانەدا

زۆر زیادی کردوه کە خوێندن و فێربوون بە ئامانج نابینێتەوەو تەنها وەکو پێویستیەکی بۆ پلەو پایەی کۆمەلایەتیو بەردەوامی ژیان سەیری دەکاتو نایەوێت خۆی ماندو بکات و فێرببێت وەکو دەڵێن تەنها بڕوانامەکەی دەوێت. ئەمانە زیاتر لە قۆناغی زانکۆدا دەردەکەون کە نییەتی فێربونیان تیا نابینرێتەوە.

**مامەڵەکردن لەگەڵ خوێندکاری بەهرەمەند:** منداڵانی بەهەرمەند سەرمایەی نیشتمانین، ئەوان هۆکاری پەرەسەندنو بەرەوپێشەوچونی کۆمەلگاکانن، بۆیە دۆزینەوەو چاودێریکردنیان ئەرکی هەموو مامۆستایەکە، ڕێنمایی ناسینی تواناو بەهرەمەندیەکانیانوچۆنیەتی مامەڵەکردنیان:

- پێویستە گرنگی بە خوێندکارە بەهرەمەندەکان بدرێتو دایكو باوکی ببینرێتو بۆیان ڕونبکەرەوە کە منداڵەکەیان بەهرەمەندەو چۆن مامەڵەی بکەن لەماڵەوەو چی بۆدابین بکەن.
- ژینگەیەکی بۆدابین بکرێت تا بتوانێت ئەو بەهرەمەندیەی پەرەپێبدات وەکو دابینکردنی ئەو یاریانەی کە پەرە بە گەشەی عەقڵی دەدات و ئەو یاریانەی وەکو مەتەڵ وایە.کە دەبێت منداڵەکە بەدوای چارەسەریدا بگەڕێت.
- ڕێنمایی کردنی خوێندکارەکە بۆ فێربونی خوێندنەوەی کاراو هەڵبژاردنی ئەو کتێبانە کە ناوەڕۆکی زانستی و بیرمەندی وەها بێت تا هاوکاری بکات بۆ زیاتر پەرەسەندنی بەهرەمەندیەکەی.
- ڕاهێنان پێکردنی بۆ ئەوەی پێشبینی ڕوداوەکان بکات لە ڕێگەی شیکردنەوەی مەنتقی و پێدراوەکانی بەردەستیەوە.

- کارلێکی زانستی لەگەڵ خوێندکارەکەدا، لە ڕێگەی ووتووێژکردن لەگەڵیدا لەو بوارە زانستیانەوە لەسەر بابەتی پرۆگرامی وانەکانی یان کاروباری زانستی ژیانی ڕۆژانەی.
- یارمەتی خوێندکارەکە بدرێت کە بۆچونو هەستەکانی دەببڕێت، بە گرنگیان بزانێت، واتە تواناکانی خۆی بناسێتو ڕێزی بۆیان هەبێت.
- مامۆستاکە هەمو پرسیارەکانی ئەم خوێندکارە وەڵامبداتەوە جا ئەگەر پرسیارەکەی لە ناو بابەتی وانەکەدا بێت یان لە دەرەوە.
- بەدواداچونی هەبێت بۆ پێشکەوتنەکانی ئەم خوێندکارە هەتا ئەگەر پێویست بوو پرۆگرامی تایبەتی بۆ دابڕێژرێت.

**مامەڵەکردن لەگەڵ خوێندکارە نەرێنیەکان:** ئەو خوێندکارانەی کە هەستێکی نەرێنیو خراپیان هەیەو هەست بە جۆرێك لە نشوستی دەکەن کاتێك دێن بۆ قوتابخانە، مامەڵە کردن لەگەڵ ئەم خوێندکارانە وەکو ئەمەی لای خوارەوە ئەنجام بدریت باش دەبێت.

١. هۆکاری هەستکردن بە نشوستی خوێندکارەکە دیاریبکرێت.

٢. تاقیکردنەوەی خوێندکارەکان پێش دەستپێکردن بە وانەکەو زانینی ئەوەی کە ئەو خوێندکارە ئارەزوی چییە کەبەدەستی بهێنێت لەو وانەیەدا.

٣. خوێندکارەکە بخەیتە ناو کاری بە کۆمەڵەوە لەگەڵ خوێندکارەکانی تری پۆلەکەیدا تا وردە وردە ئەو هەڵوێستە نەرێنیانەی کەم بکاتەوە.

**مامەڵەکردنی خوێندکاری گێرەشێوێن:** ئەو خوێندکارەی هەمیشە پشێوی دەنێتەوە، دەبێت لەگەڵیدا زۆر بە ئارامی بجولێتەوە عەقڵو مەنتق بەکاربهێنیت، کۆنترۆڵی هەڵچونەکانی خۆت بکەیت لەبەرامبەر کێشەکانیو ئەوە بخەیتەوە یادی خۆت کە کێشەکەی مەبەستی کەسی مامۆستاکە نییە. ڕاستەوخۆ ڕوبەروی هەڵمەچۆ و تورە مەبە و ڕێگای پێ بدە تا بۆچونەکانی دەرببڕێت بەرامبەر بە قوتابخانەو مامۆستاو وانەکان. نابێت خۆتی لێ دور بخەیتەوە، مامەڵەی بکەو هەوڵ بدە کە هەندێك ڕێوشوێنی نیشان بدەیت کەچۆن لە کاتی فشاروبارە قورسەکاندا مامەڵە بکاتو چارەسەری کێشەکانی بکات.



خۆت لە بێنەو بەردە دوربخەرەوە لەگەڵیدا تا دەگاتە ئەوەی هەندێکجار ڕەفتارەکانی پشتگوێی بخەیت(هەمو کاتێك نا).با ڕەخنەکانیش بۆی لە ڕێگەی هاوڕێکانیەوە لێی بکرێت. واتە مامۆستا ڕاستەوخۆ خۆی ڕەخنەی نەکات با هاوڕێکانی ڕەخنەکانی پێ بڵێن. مامۆستای زیرەك ئەو مامۆستایەیە کە پاڵنەر و هۆکاری ئاژەوە نانەوەی خوێندکارەکە هەست پێبکاتو بزانێت بۆچی وا دەکات. لەوانەیە ئامانجی ئاژەوەنانەوەی بۆ ئەوە بێت، کە سەرنجی مامۆستا بۆ لای خۆی ڕابکێشێت. لەم کاتەدا مامۆستا با ئەو ئەرکو کارانەی پێ بسپێرێت تا ئەو پێویستی خۆدەرخستنی بۆ پڕ بکاتەوە. یان لەوانەیە هۆکارەکەی پەیامێك بێت بۆ مامۆستا تا لە ڕونکردنەوەی وانەکە بوەستێت، چونکە ئەو لێی تێنەگەیشتووە توشی ناڕەحەتی بووە. ئەگەر مامۆستا لەو

پەیامە شاراوانە تێبگات زۆر بە زوویی کێشەکەی چارەسەر دەکات پێش ئەوەی ببێت بە ئاژاوە لە پۆلدا. بەڵام خۆ گێلکردن لەو پەیامانە وەکو ئەوەیە کە سەرت لە ژێر لمدا بشاریتەوە.

**مامەڵەکردن لەگەڵ خوێندکاری باش و ئەرێنی:** ئەو خوێندکارانەی کە زۆر هاوکارن بۆ مامۆستاو خۆی دەستپێشخەری دەکات بێ ئەوەی هیچ کارێکی لێداوا بکرێت. دەتوانیت پشتی پێ ببەستیت. وەکو ئەوەی دوای ڕونکردنەوەی خۆت لە کۆتایی وانەکەدا داوای لێ بکەیت کە وانەکە کورت بکاتەوە بۆ هاوپۆلەکانی ڕونبکاتەوە. یان ڕۆڵی سەرەکی لەناو وتوێژکاندا بدەیتێ. ئەم جۆرە خوێندکارانە دەبنە هاوکاری مامۆستا لە پۆلدا.

**مامەڵەی ئەو خوێندکارانەی کە دەیانەوێت خۆیان دەربخەن:** ئەم جۆرانە وای دەردەخەن کە هەمو شتێك دەزانن. ئەم جۆرە خوێندکارە حەز دەکات زۆر دەرکەوتوو بێت. ئەگەر ڕەخنەت هەبوو با هاوڕێکانی ئەو ڕەخنەیەی لێبکەن. تۆ دەتوانیت ئەرکی ئەوەی پێ بسپێریت کە ڕاپۆرتێك ئامادە بکاتو ڕونی بکاتەوە بۆ هاوڕێکانی. و پاشان تۆ زۆر دەستخۆشی لێ بکە لەبەردەم هاوپۆلەکانی تا ئەو پێویستیەی بۆ پڕ بکرێتەوە واتە تۆ بواری ئەو خۆدەرخستنەی بۆ دروست بکە.

**مامەڵە لەگەڵ خوێندکاری زۆر بڵێ:** ئەوەی کە بە بێ هۆ زۆر زۆر قسە دەکات لە پۆلدا. دەبێت مامۆستا قسەکانی پێ ببڕێت بەشێوەیەك کە سنورێك بۆ وەڵامدانەوە وقسەکانی دابنێیت. دەتوانیت ووزەی ئەو خوێندکارە بۆ خوێندنەوەی وانەکە بە دەنگی بەرز پێ بسپێرێت. یان خوێندنەوەی ئەو شتانەی لەسەر وایت بۆرەکە نوسراوە. یان داوای لێ بکەیت کە بابەتێك باس بکات بۆیان، یان وەڵامی پرسیارێك دوبارە بکاتەوە. ئەمەش واتای ئەوەیە تۆ

ڕێی لێدەگریت کە لە خۆیەوە قسە بکات وای لێدەکەیت کە ڕابێت بۆ مەبەستێك قسە بکاتو قسەکانی سودبەخش بێت.

**مامەڵە لەگەڵ خوێندکاری شەرمن:** هەندێك خوێندکار هەستی شەرمنیان تیادایە. ئەو خوێندکارانە لەوانەیە ئاستی باوەڕبەخۆبونیان لاواز بێت، لە شکست بترسنو لەوە بترسن کە هاوپۆلەکانی گاڵتەی پێ بکەن.

- ماموٚستا هەڵەکانی ئەم خوێندکارانە زۆر زەق نەکاتەوە لە پۆلدا. زۆریش تەرکیز نەکاتە سەری وەکو ئەوەی زۆر سەیری بکات. دەنگی ئەم خوێندکارانە زۆرجار نزمە، بۆیە با ماموستا نزیکی خوێندکارەکە بێت تا بتوانێت گوێی لێ بێت وەڵامەکەی چییە.
- ماموٚستا پرسیاری ئاسانی لێ بکات تا باوەڕی بە خۆی بە هێز ببێت. پاشان وەسفی وەڵامدانەوەکەی بکات وهانی بدات بەم شێوەیەی لای خوارەوە.
- سەرەتا پرسیارێك ناڕاستەی خوێندکارێکی نزیکی ئەو بکە تا پرسیارەکە بۆی ڕوون بێت. پاشان لێی داوا بکە کە وەڵامی خوێندکارەکەی تەنیشتی دوبارە بکاتەوە. یەکسەر دەستخۆشی لێ بکەو ئافەرینی بکە. پاشان داوا لە خوێندکارەکانیش بکە کە ئەوانیش دەستخۆشی لێ بکەن ئیتر یان بە چەپڵەیەك یان بە وتنی ئافەرین و زۆرباشە بێت.
- پاش ئەمە پرسیارەکە ناڕاستەی خۆی بکەو با پرسیارێك بێت کە وەڵامەکەی بە ڕاست یان هەڵە بێت. ئینجا پاداشتێکی گونجاوی بکە.
- پاشان پرسیارێکی لێ بکە کە وەڵامی کورتی هەبێتو هەر بە هەمان شێوە پاداشتی گونجاوی بکە.

- دوای ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە داوای لێ بکە بێتە پێشەوەی پۆلەکەو وەڵامەکەی بۆ خوێندکارەکان بڵێتەوەو ئەوانیش پاداشتی بکەنەوە تا باوەڕ بەخۆبونی زیاتر ببێت.
- پاشان داوای لێ بکە کە پەرەگرافێك بخوێنێتەوە لە پێشی خوێندکارەکان با زۆر درێژ نەبێت و بە هەمان شێوە خۆت دەستخۆشی لێ بکەو دواتر خوێندکارەکان.
- دوای ئەمانە داوای لێ بکە کە وتووێژ لەسەر بابەتێك بکات لەبەردەم خوێندکارەکاندا.
- پاشان لە چالاکیەکی ناو قوتابخانەکە بەشداری پێ بکە بابەتێك یان شتێك بخوێنێتەوە لەبەر دەمی مامۆستاو بەڕێوبەرو ژمارەیەك خوێندکاری زۆرتردا.

**مامەڵەکردنی ئەو خوێندکارانەی کە دژایەتی هەمو شتێك دەکەن:** نابێت مامەڵەی مامۆستا لەگەڵ ئەم جۆرە خوێندکارەدا شکانەوەو لێدانی کەرامەتی بێت، بەڵکو دەبێت وزەی ئەو خوێندکارە لە پێناو سودی گشت خوێندکارەکان بەکاربهێنێت. وەکو ڕابەرایەتیکردنی خوێندکارەکانی تر، یان بکرێت بەنوێنەری خوێندکارەکان لە کۆنگرەو یان هەندێك بۆنەی پەروەردەییدا.

**مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو خوێندکارانەی کە بێشەرمن و هیچ کاریگەریان لێ ناکات:** لە لایەنی کەسێتی و لێهاتویەکانیو ئەو شتانەی دەیزانێت پرسیاری لێبکەو هەندێك ئەرکی بدە بەسەردا. کە خۆی حەزی لێی بێتو بیەوێت ئەنجامی بدات.

**مامەڵەکردن لەگەڵ جۆری خۆبەگەورە زان:** هیچ ڕەخنەی مەکە هەوڵ بدە کە سەرنجی بۆ لای خۆت ڕابکێشیت بە شیوازی وەسفکردن بەتایبەت لەو هەڵوێستانەی کە تیادا سەرکەوتوو بووە.

**مامەڵەکردن لەگەڵ جۆری خوێندکاری داخراو:** ئەم جۆرە خوێندکارانە کەم دوون زۆر بیردەکەنەوە لەناو خۆیاندا، زۆرجار بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری مامۆستا پێویستیان بە کاتی زیاتر هەیە، چونکە یەکسەر نایانەوێت وەڵام بدەنەوە و زیاتر بیری لێدەکەنەوە بۆیە مامۆستا دەبێت کاتیان بداتێو بەرامبەریان بەسەبر بێت. واتە ناچاری زو وەڵامدانەوەیان نەکات. یان کاتێك پرسیاری لێدەکەیت بیرۆکەی گشتی بۆ ڕون بکەرەوەو ئینجا پرسیارەکەی لێ بکە. هەوڵی ئەوەش بدە کە بەشداری پێ بکەیت لەکاری گروپیندا لەناو پۆلدا.

**مامەڵەکردن لەگەڵ جۆری لێکۆڵەر:** ئەو خوێندکارانەن کە لە کەمیندا بن بۆ هەڵەکانی مامۆستا هەمیشە هەوڵ دەدەن کە هەڵە لە مامۆستا بگرێت.تۆش یەکسەر وەڵامی پرسیارەکانی مەدەرەوە، کاتێك بدە بەخۆتو پرسیارەکەی ئاڕاستەی هەموو خوێندکارەکان بکە. ئەگەر زانیت لەبابەتەکەدا هەڵەت کردوە ئەوا دان بنێ بە هەڵەکەتدا. دەبێت بوارو هەڵوێستێکی وای بۆ دروست بکەی کە ڕەفتاری خۆی ڕاست بکاتەوە.

**مامەڵە لەگەڵ جۆری سست و خەواڵو:** ئەو جۆرە خوێندکارانەیە کە هیچ توانایەك نیشان نادات‌و زۆر سست‌و بێ جوڵەیە کاریگەری دەکاتە سەر نمرەو دەستەکەوتی خوێندنی دەبێت هانی بدەیت‌و پاڵنەری بۆ زیاد بکەیت بەوەی لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر بەراوردی پێشکەوتنەکانی بکەیت بۆ نمونە؛ پێی بڵێ تۆ لە کۆرسی یەکەمدا نمرەکەت کەم بوە، بەڵام ئەم کۆرسە باشە دو نمرەت زیاد کردوە ڕاستە دەرنەچویت، بەڵام ئەمە نیشانەیە بۆ ئەوەی کە دەتوانیت هەوڵ بدەیت‌و دەربچیت. ئەو ئەرکانەی بدەیتێ کە ئاستەکەی لەو وانەیەدا لاوازە باشتر بکات‌و لە چالاکی گشتیدا بەشداری پێ بکە.

**مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو خوێندکارانە کە تێگەیشتنیان لاوازە:** ئەو کەسانەی کە تێگەیشتنیان لاوازە پێویستیان بەوەیە کە چەند جارێك بابەتەکەیان بۆ ڕون بکەیتەوە. بۆ ئەوەی تێبگات شێوازی وانە ووتنەوەی جۆراو جۆر بەکاربهێنە بۆی، سەرباری ئەوەی کە ئەرکی ماڵەوەی زۆرتری بدەرێ. هەروەها شێوازی گروپین لە پۆلدا بەکاربهێنە تا خوێندکارە زیرەکەکان بتوانن یارمەتی بدەنو بابەتەکانی بۆ ڕون بکەنەوە زیاتر لە چەند جارێك(علی، ٢٠١٧، انترنت).

**سودەکانی ڕەچاوکردنی جیاوازی تاکایەتی لە بواری پەرەردەدا**

- گرنگیدان بە فێرکردنی هەموو ئاستەکان لەناو خوێندکاراندا.
- ئاستی دەرچونی خوێندکاران بەرز دەکاتەوە.
- بەهەدەردان لە پرۆسەی فێرکاریدا کەم دەکاتەوە.
- ئاستی خوێندکارەکان دەگەیەنێتە ئەو ئاستەی کە بۆیان دانراوە لە ئامانجە پەروەردەیەکاندا.
- چاودێریو پڕکردنەوەی پێداویستی زۆرینەی خوێندکاران لەناو پۆلدا.

**جیاوازی تاکایەتی لە نێوان شێوازی فێربوونی تاکەکەسیو جۆراو جۆری وانە ووتنەوەدا**

شێوازی فێربوونی تاکەکەسی(تفرید التعلیم)سیستمێکی فێرکاریە بەشێوەی پرۆگرام داڕێژراوە، کە ڕێگە بە ڕەچاوکردنی جیاوازی تاکایەتی خوێندکارەکان دەکات لەناو گروپی فێرکاریدا، بەئامانجی گەیشتنی ڕێژەی(٩٠٪)ی خوێندکاران بە ئاستێك لە فێربون کە بگونجێت لەگەڵ تواناو ئامادەباشیەکانیدا.

شێوازی فێربوونی تاکەکەسی ڕێکخستنی شێوازێکی فێرکاریە کە تیایدا خوێندکار کارلێك لەگەڵ هەڵوێستە فێرکاریەکاندا دەکات، لە ڕێگەی ئامرازی فێرکاری جۆراو جۆرەوە تا دەگاتە ئاستی فێربونی خواستراو، بەوەش چوارچێوەی گرنگیدان لە مامۆستاوە دەگوێزرێتەوە بۆ خوێندکار. ئەدەبیاتی پەروەدەیی پڕە لە نمونەی شێوازی فێربونی تاکەکەسی ئەو شێوازەی زیاترین بەکارهێنانی هەیە وەکو هەگبەی فێرکاریو ستراتیجی بلوم بۆ لێهاتوییو باش فێربون. ئەم ستراتیجە باشترین سیستمە، چونکە شێوازەکانی فێربونی تاکەکەسیو وانە وتنەوەی بە کۆمەڵ بەیەکەوە کۆدەکاتەوە.

## جیاوازی تاکایەتی و شێوازی فێربونی تاکە کەسی

پرۆسەی فێربونی تاکەکەسی وەکو ڕێکارەکانی پرۆسەی هەڵسەنگاندنو پێوانەکردنی ئاراستەکراو بەمەبەستی دۆزینەوەی جۆری پێداویستیەکانو ئاستەکەی بە بەدواداچونی ڕێکاری تاکەکەسی، پرۆسەی فێربونی تاکەکەسی وەکو ناوەڕۆك واتە دیاریکردنی پێویستی بنەڕەتی کە سروشتی توانای کەسەکە دەیسەپێنێت



جا نیتر تاکێکی کەمتوانا بێت یان داهێنەر بێت.پرۆسەی ڕەچاوکردنی جیاوازی تاکایەتی لە نێوان خوێندکارە ئاساییەکاندا بەو واتایە نییە کە پرۆگرامی پەروەردەیی تاکەسیان بۆ دابڕێژرێت، بەڵام بە دو ڕێگا دەتوانرێت ڕەچاوی ئەو جیاوازیەی نێوان مەیلو ئارەزووەکان بکرێت:

یەکەم: ڕێگەی بە کۆمەڵ یان گروپین ئەویش کە لەوانەیە کۆمەڵە خوێندکارێك هەمان مەیلو ئارەزویان هەبێت، بۆیە پێویست ناکات

بەتاکەکەسی وانەیان پێ بوترێتەوە. پرۆسەکە هەروەك وانە وتنەوەی بە کۆمەڵە، بەڵام ژمارەیان کەمتر دەبێت وەکو شێوازی وانەوتنەوەی هاوکارییە.

دووەم: ڕێگای تاکەکەسی: ئەمەش هەر بەمانای ئەوە نییە کە پرۆگرامی تاکە کەسی فێرکاریان بۆ دابنرێت، بەڵکو ئاڕاستەکردنی خوێندکارەکەیە بۆ مەیلو ئارەزووەکانی بەشێوازی خۆ فێرکردن. بەڵام بۆ خوێندکارانی خاوەن پێداویستی تایبەت پڕکردنەوەی پێداویستیو مەیلەکانیان لە ڕێگەی شێوازێکی فێرکاریەوە کە زۆر لەیەك جیاوازە ئەنجام دەدرێت.

شێوازی وانە ووتنەوەی تاکەکەسو بەکۆمەڵی بریتیە لەگرتنەبەری ئەو ستراتیجیانە بەمەبەستی بەدیهێنانی گۆڕانکاری نیمچە بەردەوام لە ڕەفتاری خوێندکاراندا جا بەڕێگەی تاکەکەسی بێت یان بە کۆمەڵی. لەسەر ئەم بنەمایە زۆربەی خوێندکارانی پەروەردەی تایبەت (بەهرەمەندان، پەککەوتەی عەقڵیو ئۆتیزمو شڵەژانی ڕەفتاری و...هتد) پێداویستی فێرکاریان بە پێی پرۆگرامی فێرکردنی تاکەکەسی بۆ دادەڕێژرێت. هەندێکیشیان لەناو پرۆگرامی گشتی پەروەردەییو فێرکاریدا پێویستیەکانیان بۆ پڕدەکرێتەوە وەکو(پەککەوتەیی بینینی، بیستنی، پەککەوتەی تەندروستی جەستەیی) بە شێوازی وانە ووتنەوەی بە کۆمەڵی، بۆ هەندێکیشیان هەردو شێوازەکە دەگیرێتەبەر(صاكال و خليفه،٢٠١٧، لا ١١).

## دووەم. جۆراو جۆری وانە وتنەوە

فەلسەفەیەکی پەروەردەییە مەبەست لێی ئەوەیە کە مامۆستا سروشتی وانەکەی بەپێ فێرخوازەکان ڕێکبخات، جۆرەها شێوازی وانە ووتنەوە بەکار بهێنێت، واتە گونجاو بێت بۆ تواناو لێهاتوییو مەیلو حەزی فێرخوازەکان. مامۆستا بتوانێت ڕەگەزەکانی پرۆگرامەکە بگۆڕێتو چاکسازی تیادا بکات تا

لەگەڵ تایبەتمەندی فێرخوازەکاندا بیگونجێنێت، نابێت مامۆستا وا چاوەڕوان بکات کە خوێندکارەکان خۆیان بەپێی پرۆگرامەکە بگۆڕن تا بگونجێن لەگەڵیدا. جۆراو جۆری شێوازی وانە ووتنەوە لەگەڵ باش بەڕێوەبردنی پۆلدا ناکۆك نییە، ئەم شێوازە بەواتای ئاژاوەو فەوزاو بێکۆنترۆڵی ناو پۆل نییە، ئەرکی زیاتریش نادات بەسەر خوێندکارەکاندا و سزاش نییە بۆ خوێندکارە سەرکەوتوەکان. ئەو جۆرانەی کە لە ئێستادا لە زۆر وڵاتدا بەکار دەهێنرێت وەکو

- **فێرکردنی ئەلکترۆنی**

به واتای بەشداری پێکردنی زانیاری لە ڕێگەی ئەنتەرنێتەوە. ئەمە بوار بۆ خوێندکار دەکاتەوە تا توانای داهێنانی هەبێتو کەفائەتی ئەوانەش زیاتر دەکات کە کاتیان نییە بۆ خوێندنی ناو پۆل. چونکە فێرکردنی ئەلکترۆنی ناوەڕۆکی وانەکان لە ڕێگەی وانەی دەنگی یان ڤیدیۆیی یان پرۆگرامی فێرکاری تر پێشکەش بە خوێندکار دەکات، خوێندکار دەتوانێت لە کۆمپیوتەر یان مۆبایلەکەیدا دایبەزێنێتو هەر کاتێك یان لە هەر شوێنێك بیەوێت گوێی لێ بگرێتو وانەکان هەمیشە لەبەردەست خوێندکاردا دەبێت.

- **لافاوی زهنی (العصف الذهني)**

ئەم جۆرە وانە ووتنەوەیە بەو شێوازەیە کە مامۆستا پرسیارێك یان بابەتێك دەخاتە بەردەم خوێندکارەکان تا قسەو باسی لەسەر بکەنو بۆچونەکانی خۆیانی لەسەر بڵێن ئیتر بە ڕەخنە بێت یان پێشنیاری چارەسەری بێت یان زانیاری زیادە بێت، پاش ئەوەی کە مامۆستاکە هەمو پێشنیارو بۆچونەکان وەردەگرێت ئینجا کورتیان دەکاتەوەو ڕێکیان دەخاتو

دیسانەوە بە هاوکاری خوێندکارەکان باشترین‌و گونجاو ترینیان لێ هەڵدەبژێرێت. ئەم جۆرە وانە وتنەوەیە لایەنی باشەکەی ئەوەیە کە بوار بۆ ئازادی بیرکردنەوەی دروستدەکات‌و تەرکیز دەخاتە سەر بیرکردنەوە لە زیاترین ڕێگای چارەسەری.

- **ڕاهێنانی مەیدانی‌و پراکتیکی:**

ئەم جۆرە لە زانکۆکاندا زۆر بڵاوە خوێندکار دەخاتە ناو مەیدانی پسپۆریەکەی خۆیەوە تا بتوانێت ئەو زانیاریە تیۆریەی کە خوێندویەتی لە مەیدانی پسپۆریەکەی خۆیدا تاقیبکاتەوە تاچەند تێگەیشتوە تا چەند دەتوانێت جێبەجێیان بکات، وەك ئەوەی خوێندکارانی کۆلیجی یاسا دەنێرن بۆ ناو دادگاکان تا ڕاهێنانی پراکتیکی بکەن. خوێندکارانی کۆلیجی پەروەردە دەنێرن بۆ ناو قوتابخانەکان. خوێندکارانی کۆلیجی پزیشکی دەنێرن بۆ ناو نەخۆشخانەکان....هتد.(صاکال و خلیفە،٢٠١٧،ل١٢).

# سەرچاوەکان


١) الأمارة، اسعد الشريف(٢٠٤).سايكولوجية الفروق الفردية علم النفس الفارقي.العمان. دار الصفاء للنشر و التوزيع.

٢) بحري، نادية(٢٠١٧). الفروق الفردية عند التلاميذ. رسالة ماجستير المنشورة.جامعة عبد الحميد بن باديس. كلية الأدب العربي و الفنون.قسم اللغة العربية.

٣) توماس جومارمور(ب.ت). الشخصية و الفروق الفردية.ترجمة ابو عطية،سهام درويش، علي، مراد عيسى و الأخرون

٤) حسن، نشوان ّيعقوب (ب.ت): التعلّيم المفرد بّين النظرّية والتطبّيق، ط ١، دار الفرقان للنشر والتوزّيع، عمان، ص١٣٦.

٥) الخالدي، أديب محمد(٢٠١٣). سيكولوجية الفروق الفردية و التفوق العقلي. ط١، دار وائل للنشر و التوزيع، الأردن،

٦) خليل، سعادة(٢٠٠٤). الفروقات الفردية بين الطلاب و كيف نفهمها. نشر الكترونيا على الموقع www.nashiri.net

٧) ديسبونزا، جو(٢٠٢١). كمال ذهن. ط١. ترجمة روزبة ملك زادة و هيمن برين. تهران. نشر پرديس اباريس.

٨) الديدي، عبد الغني(١٩٩٧). قياس و تحسين الذكاء عند الأطفال. ط١. لبنان. دار الفكر اللبناني للطباعة و النشر.

٩) الزبيدي، حسن بن سالم(٢٠١٥). علم النفس النمو.ط١. عمان مؤسسة الوراق للنشر و التوزيع.

١٠) الزعبي، احمد محمد(٢٠١٥). سيكولوجية الفروق الفردية و تطبيقاتها التربوية. ط٢. كتبة الرشد النشارون.

١١) زيدان، محمد مصطفى و السمالوطي، نبيل(١٤١٥). علم النفس التربوي. جدة. دار الشروق للنشر.

١٢) سليمان، سناء محمد(٢٠٠٦).سيكولوجية الفروق الفردية و قياسها، ط١، عالم كتب القاهرة،ص٣١.

١٣) سيف الدين، هدي برهان(٢٠١٤).الإحصاء في علم النفس المنحنى الإعتدالي.

١٤) سيف الدين، هدي برهان(٢٠١٤).الإحصاء في علم النفس(المنحنى الإعتدالي)

١٥) الشازلي، عبد الحلّيم محمد (٢٠٠١). علم النفس العام، ط ٢، المكتبة العربّية، الأسكندرّية ، ص٢٠١

١٦) شريف، عمر و كامل، نبيل(٢٠١١). المخ ذكر ام انثى. ط٢.القاهرة. مكتبة الشروق الدولية.

١٧) الشيخ، سليمان الخضري(٢٠١٢).سيكولوجية الفروق الفردية في الذكاء.ط٤. عمان. دار المسيرة للنشر و التوزيع.

١٨) صاكال، فاطمة رمضان و خليفة، عبد السلام الشيباني(٢٠١٧). جامعة الزاوية. مجلة كلية التربية.العدد السابع.

١٩) طه، فرج عبد القادر و الآخرون (١٩٩٣). موسوعة علم النفس و التحليل النفسي. الكويت. دار سعاد صباح.

٢٠) عودة، الرّيماوي محمد عودة (١٩٩٣). سّيكولوجّة الفروق الفردّية، ط١. عمان، دار الشروق، ، ص٣٦.

٢١) علي، احمد حسن محمد(٢٠١٧).مهارة التعامل مع الفروق الفردية لطالب. اخذ من هذا الموقع. اخذ من موقع التعليم الجديد.

٢٢) غانم، محمد حسن(ب.ت). علم النفس الفارقى.كتاب الكترونى من موقع كتابى.

٢٣) القذافي، رمضان محمد القذافي(١٩٩٣).الشخصية. ط١، دار الكتب الوطنية، بنغازي

٢٤) القضاة، محمد فرحان والترتوري، محمد عوض (٢٠٠٦).أساسّيات علم النفس التربوي النظرّية والتطبّق، ط ١. عمان. دار الحامد للنشر والتوزّيع.

٢٥) مأمون، صالح. ٢٠٠٨. الشخصية بناءها و تكوينها.ط١.دار اسامة.عمان.

٢٦) معوض، خليل ميخائيل(٢٠٠٥). القدرات العقلية. مصر، مركز الإسكندرية للكتاب

٢٧) منس، محمود عبد الحلّيم(ب،ت)، علم النفس التربوي، ط٠، دار المعرفة الجامعّة للنشر والتوزّع، ، ص ١٣٧.

٢٨) منصور، عبد المجيد سيد احمد و التويجري، محمد عبد المحسن و الفقي، اسماعيل محمد(٢٠١٤). علم النفس التربوي.الرياض. ط٩. مكتبة العبيكان.

٢٩) منصور، عبد المجيد منصور و الآخرون (٢٠٠٢).السلوك الأنساني بين التفسير الإسلامي و علم النفس المعاصر. القاهرة. مكتبة الأنجلو المصرية.

٣٠) منصور، عبدالمجيد و الشربيني، زكريا و الحشاش، عبداللطيف)(.2005التقويم التربوي األسس والتطبيقات. الرياض، دار الزهراء

٣١) نبهان، يحي محمد(٢٠٠٨). الفروق الفردية و صعوبات التعلم. عمان. اليازوري.

٣٢) هنية، خّير الدّين (١٩٩٩)ز تقنّات التدرّيس، ط٠، بدون نشر، الجزائر.

Damasio, A. (1994). Descartes' error. New York: G. P. Putnam's Sons

Fowler, C. A. (1981). Production and perception of coarticulation among stressed and unstressed vowels. Journal of Speech and Hearing Research, 24, 127–139.

Gazzaniga, M. S. (1995). The cognitive neurosciences. Cambridge, MA: MIT Press

Kinard, E. M. (2001). Perceived and actual academic competence in maltreated children. Child Abuse and Neglect, 25(1), 33–45.

LeDoux, J. (1998). The emotional brain: The mysterious underpinnings of emotional life. London: Weidenfeld & Nicholson.

Martino, G., & Marks, L. E. (2000). Cross-modal interaction between vision and touch: The role of synesthetic correspondence. Perception 2000, 29(6), 745–754.

Mountcastle, V. B. (1998). Perceptual neuroscience: The cerebral cortex. Cambridge, MA: Harvard Press.

Roland, P. E., & Zilles, K. (1998). Structural divisions and functional fields in the human cerebral cortex. Brain Research Reviews, 26, 87–105.

Rose, D. H, Meyer, A. Teaching Every Student in the Digital Age: Universal Design for Learning, the Association for Supervision and Curriculum Development, 2002

Vygotsky, L. (1962/1996). Thought and language (Rev. Ed.). Cambridge, MA: MIT Press

# Psychology of Individual Differences

- پەروەردەی دروست ئەو پەروەردەیەیە کە وای دادەنێت تاکەکەس ئامانج و ئامرازیشە لە هەمان کاتدا.

- بۆ مامۆستا زۆرگرنگە کە شارەزای سایکۆلۆژیای جیاوازی تاکایەتی بێت، چونکە بەهۆیەوە دەتوانێت بەسەر کێشەکانی خوێندکاران و وانە وتنەوەدا زاڵ بێت و بە پێی پێویستی خوێندکارەکان مامەڵەیان بکات.

- ئێمە ناتوانین داوا لە مرۆڤەکان بکەین کە وەکو یەک مامەڵەمان بکەن،چونکە هەمو کەسێک شێوازی خۆی هەیە لە مامەڵەکردنو هەڵسوکەوتو هەڵچونەکانیدا.

- تاڕادەیەک بێتوانایی پیاوان لەدەربڕینی هەستەکانیاندا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سەنتەری هەستەکانیان لە نیوە گۆی ڕاستەو سەنتەری زمانیش لە نیوە گۆی چەپە، بەڵام لای ژنان سەنتەری زمانو هەستەکانیش بەسەر هەردو لای نیوە گۆی ڕاستو چەپیشدا دابەش بووە. بۆیە ژنان دەتوانن زۆر بەخێرایی هەستەکانیان بە ووتن دەرببڕن.

- جۆراوجۆری تواناکان لای کەسەکان ئەو بوارە دابیندەکات کەتاکەکان لە یەکێک لەتواناکاندا سەرکەوتوو بن، بۆیە ناکرێت ئەو بڕیارە بەسەر کەسێکدا بدەین کە لەهەموو بوارەکاندا بەگشتی سەرکەوتوە، چونکە لە هەندێک لە توانا عەقڵیەکاندا لەوانەیە سەرکەوتو نەبێت یان مامناوەند بێت، کەواتە ناکرێت بڕیار بەشێوەی گشتی بەسەر کەسەکاندا بدرێت بڵێین فلانە کەس کەمتوانای عەقڵیە یان زۆر بیلمەتە لە هەمو تواناکانیدا بگرە ئەوە بابەتێکی ڕێژەییە لای هەمو تاکێک لە مرۆڤەکان.

بە هاوبەشی لەگەڵ
کتێبخانەی بێدار





لە بلاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ(6000)دینار